هەینی ( ٨ ) ربیع الاول ( ١٤١٦ ) ی کۆچی ٤ ئابی ( ١٩٩٥ )









# جەماوەر

*Jamawar*

گۆڤارێکی هەفتانەیە ڕاگەیاندنی ناوەندی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان / عێراقە دەری دەکات



## با ژیانمان بە گوفتار و کرداری محمدی (د.خ) رابەر برازێنینەوە



## یادی لەدایک بوونی پێغەمبەری ئیسلام ڕۆژێکی پرشنگدارە لە مێژووی مرۆڤایەتی دا





# جەماوەر

هەینی ( ٨ ) ربیع الاول ( ١٤١٦ ) ی کۆچی ٤ ئابی ( ١٩٩٥ )

## لەم ژمارەیەدا :


١ـ وتەی جەماوەر ............ دەستەی نووسەران ( ٣ )
٢ـ جاسوسیەت ............ محمد احمد خدر ( ٧ )
٣ـ بزووتنەوەی ئیسلامی و ............ باوکی ئوسامە ( ١٠ )
٤ـ هەواڵەکان ............ بەشی هەواڵ و سیاسەت ( ١٤ )
٥ـ دانیشتنێکی کورت لەگەڵ ............ پەیامنێری جەماوەر ( ١٩ )
٦ـ بەرەو راگەیاندنێکی ئیسلامی ............ محمد حسن ( ٢٣ )
٧ـ دیکتاتوریەتی من گەرایی ............ ئارام ئەحمەد جاف ( ٢٨ )
٨ـ رۆمانی راپەرین ............ عمر میراودەلی ( ٢٩ )
٩ـ سەردانی سیاسەت مەدار ............ عمر یوسفی ( ٣٣ )
١٠ـ کاریکاتێر ............ ( ٣٨ )
١١ـ شێوازی بانگەوازی ............ و . کاوە ( ٣٩ )
١٢ـ ئیسلام بەرنامەی ژیانە ............ باوکی مەڕوان ( ٤٢ )
١٣ـ مافی هاوبەش ............ سەردار رەزا ( ٤٥ )
١٤ـ سەرەتایەك دەربارەی رەخنە ............ و . بەختیار ( ٤٩ )
١٥ـ چیرۆکی دەرس گوتنەوە ............ ژیان هەورامی ( ٥٥ )
١٦ـ قورئان وهەتیو ............ سەردار رەزا ( ٥٦ )
١٧ـ معرفة الرجال ( عەرەبی ) ............ سامی سلمان ( ٥٧ )
١٨ـ زمان الفاتحین ( شیعر ) ............ محمد بن سعد العجلان ( ٦٢ )


خاوەنی ئیمتیاز: احمد کاکە محمود      سەرنووسەر: عادل باخەوان



# یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری ئیسلام
# ڕۆژێکی پڕشنگدارە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا

وتەی جەماوەر

لەدایك بوونی پێغەمبەر ( صلی الله علیـــه وسـلم ) رۆژێکی پرشـنگدا ر ە لە مێــژووی مـرۆڤـایەتیـدا

بسم اللّه الرحمٰن الرّحیم

(( لقد من الله علی المؤ منیـن اذ بعـــث فیـهم رسـولا من انفسـهم یتلوا علیهـــــم ایاته و یزکیـهم و یعلمهـم الـکتـــاب و الحکمـه و ان کانوا من قبل لفی ضـــلا ل مبیـــن )).

جەماوەری مسـولْمانی کوردستان ...

بە هۆی هاتنی مانگی لە دایك بورنـــــی سـەردار وپێشـەوامان و رێ نیشاندەری مرۆڤ پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسـلم ) هاوکـــات لەگەل سـالرۆژی دامەزراندنی بزوتنـەوەی ئیسـلامی لەکوردسـتان / عیراق پڕ بـە دلْ پیرۆزبایی خۆمان و مسولْمانانی جیهان بـــە گشـتی و مسـولْمانانی کوردسـتان بە تایبەتـی دەکەیـن . هیوادارین گەلەکەمان هەمـــوو سـالْێك بە خۆشـی و شـادی یادی ئـــەم رۆژە پیرۆزە بکـاتەوە . پێویسـتە لە یادی لـــــە دایك بوونی پێغەمبەرمان محمد ( صلی اللـه علیه وسـلم ) ئەو گۆڕانکاری یە ڕیشەیی یە- مـان بێتەوە بیر کە ئیـسلام لە کومەلْگـــای مرۆڤایەتی دا بەرپای کرد ، کەلەم خالانەدا کورتـی دەکەینـەوە :-

١- ڕزگارکردنی ئادەمیزاد لە ڕووی فکـــر و بیـر و بۆچوون و پەرسـتراوەکانـــــی دا، ئەوە بوو دار و درەخت و بت و سـەدەهـــا شـتی دیکەیان دەپەرسـت و کرنوشیان بـــۆ دەبردن بە نیازی نزیك بوونەوە لـــــە خـوا بە هۆی ئیسـلامەوە ئادەمیزاد هۆشیار بووەو تێگەیشـت کە دار و بەرد بە کەلْکی پەرسـتن نایەن حونکە ئەوانیش دروســت کراو و بێ دەسـەلاتن .

٢- لە ڕووی سیاسـەت و یاساوە سیاسەتـی چەوت و بێ یاسایی سەرتاپای ناوچەکانـی گرتبۆوە بە دەها عەشیرەت و هۆز و خێـل

حوکمرانی یان دەکرد هەریەکەشیان
راو بۆچوونی خۆی بەسەر ئەوانی دیکەدا
دەسەپاند ، هەر وەك چۆن ئێستا ئەم
دیاردەیە دەبینین

٣- لە رووی هێز و سەربازی یەوە هەر کەسێك
هێز و دەسەڵاتی ببوایە هێرشی دەکردە
سەر ئەوانەی بە لاواز و بێ هێزی دەزانین
حوکم و فەرمانڕەوایەتی هی ئەو کەسە
بوو کە دەسەڵاتی هەبوو .

٤- لە رووی ئابووریشەوە داهات و سامانی
خەڵکی هەژار و چەوساوە دەچووە گیرفانی
چەند کەسێکەوە و زووربەی خەڵکی لێ ی
بێ بەش بوون ، بە کورتی قڕی و پڕی
باڵی بەسەر کۆمەلکادا کێشابوو .

٥- لە رووی نەژاد و دەمارگیری یەوە بنەماڵە
ناودارەکان دەسەلات دار بوون بەسەر
ئەوانی دیکەدا و مرۆڤ لە بازاردا وەك
کەل وپەل مامەلەی پێ دەکراو دەکڕدراو
دەفرۆشرا .

٦- یاسای کۆمەڵایەتی هیچ یاسایەك نەبوو ژن
و پیا و بەیەکەوە ببەستێتەوە هەڵس و
کەوتی مرۆڤ لە هەموو رەوشت و خوو
خدەیەکی مرۆڤ بە دوور بوو شیرازەی
کۆمەڵ بە تەواوی تێك چوو بوو .

بەلام بە هاتنی ئەم پەیامە بێ وێنەیە ئەو
گۆرانکاری بە مێژوویی بە رووی دا کە
مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو بە خۆیەوە نەدی
بوو ، روخساری کۆمەڵگا بە هەموو شێوەیەك
گۆڕا و لە نەفامێتی و بێدادی و ستەم بەد
رەوشتی و نا ئارامی رزگاری بوو پێی نایە
قوناغیکی نوی وە ، کە دادگەری و ئارامی و
ئاسودەیی و دڵنیایی و بەختیاری
کۆمەڵکایان لە ئامێز وەرێناو لە هەموو
بوارەکانی ژیان دا جیاوازی لەگەڵ
کۆمەڵگای پێشدا هەبوو ، بەلام مخابن
کاتێك مرۆڤ لەو پەیامە پیرۆزە دوور کەوتەوە
و جڵەوی بۆ ئارەزووەکانی شل کردو شوێن
بەرنامە و رێبازێك کەوت کە زادەو هەڵقوڵاوی
تێڕوانین و بیری مرۆڤ خۆی بوو ، جارێکی
دیکە تاریکایی ئاسمانی کۆمەڵگای گرتەوە و
لە سایەی فەلسەفە مرۆڤ کردەکاندا
کۆمەڵ دوچاری چەندین کێشەو قەیرانی
ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی بوو .

ئەگەر سەیری لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز
بکەین دەبینین هەر کاتێك مرۆڤ هاواری لە دەست
ستەم و بێدادی و چەوسانەوە کردبێ خودای
گەورە بە هاواری مرۆڤەوە هاتووە و بە هۆی
هەڵبژاردەترین کەسانی ناو کۆمەڵدا بەرنامەی
بۆ ناردوون کاتێ دوایین بەرنامە بە
شایستەترین نێرراوی خوایی دا نێررا
جارێکی دیکە کۆمەڵگا ئاسۆی رزگاری لێ
دەرکەوتەوە . شوێن کەوتوانی رێبازی
پێغەمبەریش ( صلی الله علیه وسلم )
لە سەردەم و قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا
بوونەتە چاو ساغ و رێ نیشاندەری خەڵك و
میللەتانیان لە هەڵدێران و ساتمەبردن
ئاکادار کردۆتەوە و دەستی ستەم و بێ
دادیان لەسەر لا بردوون . بۆیە لە
سەردەمێکدا کە بە هۆی پیلان و نەخشەی
شومی دوژمنانی ئیسلامەوە میللەتەکەمان
لە ئایینەکەی دوورکەوتەوە تا کە یشتە
رادەیەکی وا کە بە لایەوە نامۆ بێ و
نەیناسێتەوە لە سۆنگەی ئەو دوورکەوتنەوە
دوچاری چەندین لادان و چورتم و قەیران بوو
بۆ خۆ رزگارکردن لە دووریانی ئەو کێشانە
هەر جارەی رووی بە لایەکدا وەردەگێرا و
دروشم و رێبازە خوازراوەکانی لە لا بوونە
دەرمانی حەوت دەردەو مەرهەمی زامان
بەلام دوای ئەزموون و تاقی کردنەوە یەکی
زۆر و شوێن سەرابی نیردوزە کەوتن ئەو

ڕاستی یەی بۆ ئاشکرا بوو کە ئەم ڕێبازە مرۆڤ کردانە نەك ناتوانن چارەسەری کێشەکانی بکەن بەڵکو زامەکانی قووڵتر و ژانەکانی بە سوێ تر کرد . لە بارودۆخێك دا کە ڕژێمی بەعس زیاتر لە (٤٠٠٠) گوندی وێران کرد و باغ و باغاتی کوردستانی سوتاند و خەڵکەکەی (انفال) کرد و بەرهەم و داهاتی بە تالآن برد و خەلکێکی زۆریشی دووچاری بەندیخانە و ئازار و ئەشکەنجە کرد لەو بارودۆخەدا بزووتنەوەی ئیسلامی هەستی بەو ئەرکە خوایی یە کرد کە دەبێ ئەنجامی بدا. لە پێناوی لابردنی دەستی ستەم و بێدادی و ڕامالّینی هەوری ڕەشی نائارامی و دلەڕاوکێ ، هاتە مەیدان و شان بە شانی هێزە سیاسی یەکانی دیکەی کوردستان دەنگی جیهادی بەرز کردەوە و هەنگاوی نا. لەو پێناوەش دا چەندین زانا و ڕۆڵەی لێهاتوو گەنج و لاوی مێژخاسی کردە قوربانی سەرخستنی کاروانی ڕێگای بەرە و سەرفرازی ، بێ گوێ دانە کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێگا .

دەربەستی ماندوو بوون و ئازار و ئەشکەنجە و هەوراز و لێژی ڕێگا نەبوو بەڵکو هەموو ئەمانەی کردنە توێشووی زیاتر ڕێگا بڕینو هەنگاو نان چونکە دڵنیا بوو لەوەی کە ڕێگاکەی تاقە ڕێگای سەرفرازی و سەرکەوتنە بە ئەرکی ئیسلامی دەزانی کە میللەتەکەمان بە ئایینەکەی ئاشنا بکاتەوە کە (١٤٠٠) ساڵ بوو کورد قبولّی کردبوو بە هۆی ئەم ئایینەوە وە و لە قوتابخانەی قورئان دا چەندین زانا و شاعیر و نووسەر و هەڵکەوتوو پەروەردە بوون کە نەوەکانی دوای خۆیان بە شانازی یەوە ناویان دەبەن. بزووتنەوەی هەر لەگەڵ هاتنە مەیدانەوە ئەو ڕاستی یەی ئاشکرا کرد کە هەڵگری ناسنامەی ڕاستەقینەی میللەتەکەیەتی خەباتی میللەتەکەی لە پێناو وەدەست هێنانی مافەکانی دا بە ڕەوا دەزانێ و لە بەرانبەر دۆز (القضية) ی کورد دا نەك هەر دوورە پەرێز ناوەستێ بەڵکو خەبات کردن لەو پێناوەدا بە ئەرکێکی ئیسلامی دەزانێ. چونکە خودای گەورە تیرە و هۆز و نەتەوەکانی بۆ ئەوە دروست کردوون کە خاوەنی بوون و کەسایەتی خۆیان بن و نابێ هیچ میللەتێك هەوڵ بدا میللەتێکی دیکە لەناو بەرێ چونکە لە ناوبردنی هەر نەتەوەیەك بە پێچەوانەی ئەو دەقەی قورئانە کە دەفەرموێ :

**((يا ايها الناس انا خلقناكم من ذكر وانثى و جعلناكم شعوبا و قبائل لتعارفوا))**

وە هەروەها دەفەرموێ :

**((يا ايها الذين امنوا لا يسخر قوم من قوم عسى ان يكونوا خيرا منهم))**

لە ژێر تیشکی ئەم دوو ئایەتە دا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە پێویستە :

١- گەلەکەمان چاکتر و باشتر بگەڕێتەوە بۆ ئایینەکەی بۆ ئەوەی یەکبوون و برایەتی و متمانەی لە ناودا بە هێز بێتەوە .

٢- بۆ خۆمان چارەسەری کێشەکانمان بکەین نەك چاو لەدەستی ئەم و ئەو بین چونکە کەس وەك خۆمان مشورمان لێ ناخوات .

٣- تەواوی کۆمەڵە ئیسلامی یەکان هەوڵ بدەن یەك بگرن و بە هاوکاری و برایەتی ئیسلامی کار بۆ ئیسلام بکەن لە هەموو بوارەکانی :

أ- جیهاد و تێکۆشان کە ئەرکێکی گرنگی ئیسلامی یە .

ب- ریزەکانمان یەك خەین .

ج- لە ژێر دروشمی ئەو ئایەتەدا :

**((و اعتصموا بحبل الله جميعا و لا تفرقوا ...))**

برایەتی و هاوکاری نێوان موسڵمانان ئەرکێکی ئیسلامی یە و نا تەبایی و لێک دووری و پەرتەوازەیی پێچەوانەی یاسا و بەرنامەی ئیسلامە .

د - پەروەردەکردنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی لە روانگەی هەمە لایەنی و گشت کیری ئیسلامەوە بێ ، نەک بخزێنرێتە ناو چوارچێوەی تەسکی کۆمەڵ و تاقمێک .

زانایانی بەرێز ...

هەڵگرانی مەشخەڵی خوداویستی ئێوە نموونەی پێشەنگی ئەو کاروانەن کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەو پێش سەرەتاکەی لە نیوە دورگەی عەرەبی یەوە بە رێبەرایەتی شایستەترین مروڤ دەستی پێکرد هەر ئێوە بوون لە شەوەزەنگە تاریکەکان دا ئەو مەشخەڵەتان بە دەستەوە گرتووە تا خەڵک بەرپێی خۆی ببینێ . ئێوەن هێمای لە خۆبوردن و جوامێری، ئێوەن میراتگری پێغەمبەر (صلی الله علیە و سلم) لا تان رون و ئاشکرایە پەیامبەرەکەمان چۆن بەکەلا بو بووە بۆ خودا و توانی بەو بیروباوەرەوە ناوازەیە وەرچەرخانێکی گەورەی مێژوویی بەرپا بکا کە تەنانەت دوژمنانیش هەندێ جار ستایشیان کردووە و نەیان توانیوە لە ئاستی رەوشت و خوی بەرز و هەڵویستە پیروزەکانی چاو بنوقێنن .

ئێوەش ئەرەتان لێ چاوەروان دەکرێ کە رێ و شوێنی ئەو رابەر و پێشەوای مروڤایەتی یە ون نەکەن و لەژێر دروشمی (لا اله الا الله) دا کۆببنەوە و خەڵک بانگ بکەن بۆ پەرستنی تاقە خودایەک و دوور کەوتنەوە لە هەمو لادان و شوێن کەوتنەکانی بەرنامەی دیکە ، چونکە هەوڵ دان بۆ ئەوەی میللەتەکەمان بە ئاینەکەی کە ئاسنامەی راستەقینەیەتی ئاشنا بێتەوە بە پلەی یەکەم ئەرکی ئێوەیە گومانی تێدا نیە کە ئەمەش ئەرکێکی گرنگە و چارەنووس و پاشەڕۆژی جیهان و ڕۆژی دوایی پێوە بەندە .



## هەڵویستێکی قورئانی

(سەعدی کوری عامر) کە والی و حیمص) بوو بە شێوەیەک دەژیا کە نەک لەگەڵ خەڵکی شارەکەدا . جیاوازی نەبوو ، بەڵکو لە ژیانێکی هەژاری و کوڵەمەرگی دا بوو جارێکیان وەفدی (حیمص) دەچنە لای ئەمیری موسڵمانان لیستەی ناوی هەژارانی شارەکەشیان لەگەڵ خۆیان دەبەن ، کاتێ ئەمیر سەیری لیستەی ناوەکان دەکا دەبینێ وا یەکەم ناو ناوی سەعدە ، ئەمیر لەو کاتەدا خۆی پێ ناگیرێ ، برێک پارەی لە کیسەکەی خۆی بۆ دەنێرێ . کاتی وەفدەکە دەکەریتەوە و پارەکە لە بەردەم (سەعد) دا دەنێن ، (سەعد) ی خوداناس و لیبراو بو خودا کیسە پارەکە دابەش دەکا بەسەر هەژارانی شارەکەی دا .



# جاسوسیەت لە شەڕی ئەیوبیەکان دا

و: محمد احمد خدر

هەر لە دێر زەمانەوە مێژووی شەڕ هاوڕێ بووە لەگەڵ مێژووی مروڤایەتی دا هەمیشە فەرماندە سەربازی یەکان لە هەموو زەمانێکدا بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن ، پشتیان بە جاسوسی بەستووە ، گرنگیان پێ داوە ، چونکە جاسوس دەتوانێ زانیاری تەواو دەربارەی بەهێزی و لاوازی دوژمن بگەیەنێتەوە بە فەرماندەکەی . هەر ئەوانیش دەتوانن پروپاگەندەی وا دروست بکەن کە دڵی دوژمن بینێتە لەرزەو گەل و پشتی بەرەی شەڕیش توشی پەشێوی و ئاڵوزی بکات . ئەوانەش ڕێ خۆشکەرن بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن . مێژووی ئەییوبی یەکانیش مێژووی شەڕو جیهاد بووە بە تایبەت ( صلاح الدینی ئەییوبی ) کە ئەستێرەی پرشنگداری ئەم خانەوادەیە ، وە جێ نشینەکانی هەمیشە شوێن پێیان هەڵگرتووە و ژیانیان تەرخان کردبوو بۆ جیهاد لە پێناوی دینی خودا ، تا دوا خەڵکیان کە مەلیک ( صالح نجم الدین ) ە کە هەمیشە خەباتی دەکرد ، کە میسر بپارێزێ لە هێرشی فەرەنسەیەکان لە ژیاننامەی ئەو پاڵەوانانەدا چەندین لاپەرەی پرشنگدار دەربارەی جاسوسی هەن کە تێیاندا لە خۆبووردووی و فیداکاری جاسوسە مسوڵمانەکانمان بەرچاو دەکەوێت کە بە چ شێوەیەک خزمەتی سوپای ئیسلامیان کردووە . وە دەورێکی باڵایان هەبووە لە بردنەوەی شەڕو بەدەست هێنانی سەرکەوتن، لێرەدا چەند نمونەیەک دەهێنینەوە لەو بارەیەوە .

لە شامدا شەڕێکی خەست بەردەوام بوو لە نێوان موجاهیدانی ئیسلام و صەلیبیەکان دا ، ( صلاح الدین ) هێزێکی گەورەی لە پیاوانی ئەسپ سوار ئامادەکرد بوو ئەوروپاش هەرە جەنگاوەرە ئازاکانی و پاڵاوتەی گەنجەکانی هێنا بوو ، تاقم لە دوای تاقم دەیناردنە مەیدانی شەڕ و پاشایانی ئەوروپاش خۆیان فەرماندەی شەڕەکانیان دەکرد . لە ساڵی ( ٥٨٥ ) ی کۆچی ( ١١٨٩ ) ی میلادی سوپای دوژمن گەمارۆی شاری ( عەکا ) یان داو ڕۆژ بە ڕۆژ گەمارۆیەکەیان توند تر دەکرد و دوساڵ و نیو ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو . مسوڵمانان لە ناو شورەکانی شاردا توشی ئازار و ناخۆشی بوون و ، ئەوپەڕی فیداکاری یان نیشان دا لە پێناوی خوادا ، ( صلاح الدین ) هەمیشە بیری لە خەڵکی ناو شار و سەربازەکانی دەکردەوە ، بێ ئارامی و دڵگرانی ڕووی تێدەکرد ، فەرمانی بە سەربازەکانی دەدا کە بچن لە میصرەوە بە دزی یەوە یارمەتی و خواردن بنێرن بۆ ( عەکا ) . ( صلاح الدین ) بۆ ئەم کارە لە ناو موجاهیدەکاندا ئەوانەی هەڵدەبژارد کە خەڵکی کەناری دەریاکان و بەناوبانگ بوون لە مەلەوانیدا . پارە و نامەی سەربازی لە پشتی دەبەستن و خۆیان دەگەیاندە ناو شاری ( عەکا ) و وەڵامی نامەکان و هەواڵی ناوشاریان بۆ فەرماندەکەیان دەهێنایەوە .

لە ناو هۆردوی (صلاح الدین) دا موجاهیدێك هەبوو خۆی خەریك کرد بوو بە بەخێوکردنی کۆتری نامەبەر لە تەنیشت خێمەکەی بورجێکی بە تەختە بۆ دروست کردبوون و هەمیشە پێیانەوە مەشغول بوو. برا موجاهیدەکانی دەوروبەری رەخنەیان لێدەگرت و پێیان ناخۆش بوو کە بەم کارەوە خۆی خەریك کردووە. دەیانگوت چیە ئەو برایەی ئێمە خۆی بە شتێکەوە خەریك کردووە کە سوودی لێوەرناگیرێ. بەلام لە رۆژانی گەمارۆی شاری (عەکا)، باشترین کەلك لەو کۆترانە وەرگیرا. کە نامەی (صلاح الدین) یان لە بالی کۆترەکان دەبەستەوە و لە شەقەی بالیان دەدا و خۆیان دەکرد بە ناو شورەکانی شاری (عەکا) و هەوالی ناو شار و جموجولی دوژمنیان دەهێنایەوە.

ئازاترین مەلەوان لە ناو هۆردوی مسولمانان موجاهیدێك بوو ناوی عیسی بوو خۆی تەرخان کردبوو بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا و گەمەی بە ترس و مردن دەکرد. خۆی فرێ دەدا پەناو دەریا، ئامێزی لە شەپۆلەکانی دەریا دەدا و لە سەریاندا تێپەری و راسپاردەی فەرماندەکەی دەگەیاندە شاری (عەکا) ی ئابلوقەدراو، کاتی لە ناو (عەکا) دەیویست بگەرێتەوە کۆترێکی نامە بەری بەرەلا دەکردوو هەوالی گەرانەوەی دەناردەوە ناو سەربازگەی مسولمانان.

وەکو کاری هەمیشەی شەوێك لە شەوان سێ کیسەی لە پشتی خۆی بەست کە هەزار دینار و چەند نامەی سەربازی (صلاح الدین) ی تێدا بوو، بەلام ئەم جارەیان ماوەیەکی بەسەردا تێپەری و هەر نەگەرایەوە و مسولمانان لە کەناری دەریا کەوتنە چاوەرێ کردن، بەلکو وەکو جاران لە ناو شەپۆلی دەریاوە سەر هەلدا و هەوالی سەرکەوتن و خەلکی ناو شاری (عەکا) بهێنێتەوە، بەلام ئەم جارەیان نەگەرایەوە، هەندێ کەس وا گومانیان دەبرد کە لەوانەیە دینەکەی دوراند بێ و خیانەتی لە سوپای ئیسلام کردبێ، بەلام (عیسی) لەوە بەرزتر و پاك تر بوو کە خیانەتی لێبوەشێتەوە. شەپۆلە هارەکانی دەریا دەستیان نایە بینەقاقای وخنکاندیان و چەند رۆژێك ئەوبەر و ئەوبەریان پێکرد تا لە یەکێك لە کەنارەکانی (عەکا) فرێیاندا کاتێ کە دۆزیانەوە، پارە و نامەکانی هەر لە پشت بوو خاچ پەرستەکان لە کاری مەلەوانە مسولمانەکان ئاگادار بوون و هەولیان دا کە رێگایان لی تێك بدەن و نەهێلن هەوالی ناو شار بزانن، بۆیە دەستیان کرد بە تۆر دانانەوە لە ناو دەریا، بەم شێوەیە چەند مسولمانێکیان گرت و ئیتر نەیانتوانی هەوالی ناو شار بزانن.

جارێکی تریش خەلکی شاری (عەکا) توشی تەنگ دەستی و نارەحەتی بوون و هەوالیان لێبرا لە فەرماندەی مسولمانان (قەراقوش) کە سەردار و والیشاری (عەکا) بوو نامەی لە بالی کۆترێکی سپی بەست و ناردی بۆ لای (صلاح الدینی ئەییوبی) داوای یارمەتی و کۆمەکی لێکرد، ئەم جارەیان (صلاح الدین پەنای بردە بەر رێگایەکی تری جاسوسی کە بە راستی بە تازەترین شێوەی جاسوسی دادەنرێت کەشتیەکی ئامادەکردو پری لە نەصرانیەکانی بەیروت کە مسولمان ببون فەرمانی پێدان کە جلی خاچ پەرستەکان

لەبەر بکەن و ریشیان بتاشن و صەلیب
بەرز بکەنەوە و بەم شێوەیە بەرەو شاری
( عەکا ) رۆیشتن ، خاچ پەرستەکان
پێشیان پێگرتن و وایان زانی کە شتی خۆیانە
پێیان وتن بەرە و ( عەکا ) دەچن وتیان
بەڵێ بۆچی تا ئێستا شارەکەتان نەگرتووە
وتیان نەخێر !
وتیان کە شتیەکی ترمان لە دوایە بیگەڕێننەوە،
بەم شێوەیە مەشغولیان کردن تا لێیان
رەت بوون و خۆیان بە بەندەری ( عەکا ) دا
کرد و مسولمانان تەکبیریان لێدا ، ئەوە
ئەو رووداوانە بوون کە لە گەماروی ( عەکا )
سەردەمی ( صلاح الدین ) دا رویان داوە .
هەروەها هەر لە شەری خاچ پەرستاندا لە
( ٦١٥ ) ی کۆچی ( ١٢١٨ ) ی زایینی
خاچ پەرستەکان گەمارۆی شاری ( دمیاط
ی میصریان دا بوو ئەمیش لە سەردەمی
مەلیك ( کاملی ئەییوبیدا ) . خەڵکی شارەکە
بەرگری یەکی شێرانەیان لە شارەکەی خۆیان
دەکرد و گیان و ماڵی خۆیان دەبەخشی لە
پێناوی پاراستنی شارەکەیاندا ، مەلیك
( کامیل ) یش سوپای لە خوارووی شار جێگیر
کردبوو دەستەوستان بوو چۆن هەواڵی
سەربازەکانی و خەڵکی ناو شار بزانێ .
تا موجاهیدێك کە ناوی ( علم الدین شمائل )
بوو هاتە پێشەوە کە خەڵکی یەکێك لە
لادێیەکانی شاری ( حماة ) بوو ، بەناوبانگ
بوو لە مەلەکردندا و ئەوەندە ئازا و
چاونەترس بوو ، ببو بە یەکێك لە پاریزگارە
تایبەتی یەکانی مەلیك ( کامیل ) ، ئەو
( علم الدین شمائل ) ە خۆی فری دایە ناو
نیلەوە ، ناو روباری نیلیش پڕ بوو لە کەشتی
خاچ پەرستەکان ، بەلام بە شێوەیەك مەلەی
دەکرد کەس هەستی پێ نەکات و خۆی گەیاندە
ناو شاری ( دمیاط ) . کە گەیشتە ناو شار
ورەی دەنایەوە بەر خەڵك و ئامۆژگاری
خۆراگری دەکردن و تەوجیهاتی مەلیك
( کاملی ئەییوبی ) پێ دەگەیاندن ئازایەتی و
لێهاتوویی ئەو موجاهیدە جێی سەرسورمانی
مەلیك ( کامیلی ئەییوبی ) بوو . بۆیە زۆر
گرنگی پێدەدرا و خزمەت دەکرا لە لایەن
مەلیکەوە ، بەرزی کردەوە و کردی بە
سەرۆکی پاریزگارەکانی، دوایی کرا بە والی
قاهیرە .
دانەری کتێبی ( شفاء القلوب فی مناقب بنی
ایوب ) دەڵێ ( المعظم عیسی بن عادل ابی
بکر ) ، نامەیەکی نارد بو لای ( علی الشوبك )
کە یەکێك بوو لە والیەکانی ، کە راهیبێك هەیە
لە شاخی بە تەنیایە و خەریکی عیبادەتە
دەبێ نەفی بکرێت ئەویش نەفی کرد ، دوای
ماوەیەکی کەم فەرمانی بۆهات کە راهیبەکە
بگێڕێتەوە و ئامۆژگاری کرد کە لەگەڵی باش
بێت و زەوی و پارەی بداتێ . والی دەڵێ لەو
کارەی مەلیك زۆر سەرم سورما لە
مەسەلەکەم کولێیەوە بۆم دەرکەوت کە مەلیك
ئەو راهیبەی ناردووە تا دەنگ وباسی
( الانبرور ) ئەبەستێ
( ئیمبراتور فریدیکی دووەم ) ی بۆ بێنێ
بۆیە ش نەفی کردووە تا گومانی پێ نەبەن ئەوە
چەند نموونەیەك بوون دەربارەی جاسوسی کردن
لە جیهادی ئەییوبی یەکان دژی خاچ پەرستان
کە مێژوونوسانی ئیسلامی بە ئەمانەت
پاراستویانە .
ئایا دەتوانین بڵێین مێژوو خۆی دوبارە
دەکاتەوە و مسولمانانی ئەم سەردەمەش
دەتوانن ئەو هونەرە بەکاربهێنن تا
دوژمن کاری دوژمنانی ئیسلام پوچەڵ
بکەنەوە .

لە کتێبی ( دراسات فی التاریخ الاسلامی )
نوسینی : دکتور . جمال الدین الشیال

# بزووتنەوەی ئیسلامی واجبێکی شەرعیە و زەرورەتێکی واقعیە

باوکی ئوسامە

بەشی یەکەم

لەم نزیکانەدا یادێکی پڕ شکۆ و شانازی و خۆشەویست دێتە پێشەوە کە ئەویش یادی لە دایك بوونی پێغەمبەری پێشەوایە ( صلی الله علیه و سلم ) ، هەر لەبەر موبارەکی ئەو یادە پیروزەیش بوو کە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی ئیسلامی ئەو ڕوزە موبارەکەیان هەڵبژارد بو ڕوزی دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامی بۆ ئەوەی ببێتە رەمزێکی ڕەوا بۆ درێژبوونەوەیەکی زیندووی ڕێبارە بەرز و بەرێزەکەی پێغەمبەری پێشەوا عەلات و سەلامی خوای لەسەربێ لە بلاو کردنەوەی ڕوناکی و ڕەواندنەوەی تاریکی و وەدیهێنانی زیانێکی پڕ عیززەت و دادپەروەری و کامەرانی بو گەلە ستەم دیدەو هەژارەکەمان ...

لەم سۆنگەیەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆمانی دەزانین لەم یادە پیروزانەدا بچڕیین بە گوێی هەموو حەقخواز و حەق دوستێکدا کە بزووتنەوەی ئیسلامی خاوەنی ڕابووردوویەکی ڕەسەنە و کاری ئیستای کارێکی سروشتی یە و بەرە و ئاسوێ داهاتوویەکی گەشەدار هەنگاو بە هەنگاو بە پشتیوانی پەروەردگار ڕێگای خوێ دەبرێت ...

بۆ ڕوشن کردنەوەی ئەم ڕاستیانەیش پێویستمان بەوە هەیە کە لەگەڵ هەموو رووداوەکان دا وەك خۆێ بژین و پەردە لەسەر ڕوخساری حەقیقەت بە ئەسپایی هەڵدەینەوە ئەوجا هەموو بنچینەو هۆکارە خودی و بابەتیەکانی پەیوەست بەم ڕاستیانە بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی زیاتر بەرچاومان ڕوشن بێت بۆ دڵنیا بوون لە ڕاستی یەکان ، تا بتوانین ڕابووردوومان شەتەك بدەین بە ئێستامانەوەو بە هێمنی و دڵنیایش داهاتووی گەشەدارمان لە ئاسوێ ئەرخەوانی حەق دا وەدەست بهێنین .

جا کاتێك دەڵێین بزووتنەوەی ئیسلامی خاوەنی رابووردوویەکی رەسەنە بەڵگەی مێژوویی و واقیعی خۆمان بەدەستەوەیە لەسەر ئەو راستی یەکە بزووتنەوە ئەو رەسەنایەتی یەی لە وەوە بەدەست هێناوە کە هەڵقوڵاوی سەرچاوەیەکی ئەصیلەو لە ناخی مێژووی رابوونی پیروزی ئیسلامی دا رەگ و ریشەی داکوتاوە .

بۆ زیاتر روشن بوونەوەی ئەم حەقیقەتەش پێویستمان بەوەیە چاوێك بەخیرایی بخشینین بەسەر بێداربوونەوەی ئیسلامی لە عێراقدا بەگشتی و لە کوردستان دا بەتایبەتی هەر بو ئەم مەبەستە وامان بە حەق و بەباش زانی کە ئەو کەسانەی خۆیان بەواقیعی لە ناو ئەم راستی یانەدا ژیاون و خاوەنی مەسئەلەکەن و ساتێك دانەبراون لە رووداوەکان ، ئەوان ئەم حەقیقەتانەمان بۆ روون بکەنەوە بە زمان و قەڵەمی خۆیان هەموو راستی یەکمان بۆ بدرکێنن .

بێ گومان یەکەم کەسێك کە شیاوی ئەوەیە و هەر لە سەرەتاوە لە ناو ئەو بێداربوونەوەیە دا ژیاوەو دامەزرێنەری کاری ئیسلامی بووەو نیوە سەدەیەکی لە بانگەواز و پەروەردە و ئەشکەنجە و ئازار و هیجرەت و جیهاد دا بەسەر بردووە ئەویش بەریز و سەروەر جەنابی ماموستا مەلا عثمان رابەری گشتی یە کە بەم چەند پرسیارە دەمانەوێت خاڵێ بخانە سەر پیتەکان ...

پرسیاری یەکەم :

بەریز جەنابی رابەری گشتی بێداربوونەوەی ئیسلامی لە کوردستان و عیراق دا کەی دەستی پێکردووە ؟ شێوازی کارکردن یەکەم جار چۆن بووە ؟ پەیوەندی نیوان بێداربوونەوە لە کوردستان دا بە هەموو عیراقەوە لە چ ئاستێك دا بووە ؟

جەنابی رابەری گشتی :

ئەوەی من ئاگادار بم هەر لە منداڵی یەوە لە ناوچەی هەڵەبجەو دەوروبەری دا بێداربوونەوە و بەگرنگ گرتنی فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپە دەستی پێ کردووە لە لایەن زانا بەرزەکانی ئەم ناوچەیەوە ، مەرحووم باوکم و هاوریکانی دەوریکی کاریگەریان بووە لەو کارەدا ... ئەمە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە پەیوەندی و هات و چۆ هەبووە لەگەل زانا و بانگ خوازە بەناوبانگ و پایە بەرزەکانی بەغداد وەك ( شیخ امجدی زهاوی و فوادی ئالوسی وشیخ قاسمی قیسی و هتد ) وە لەو کاتەدا گوڤاریك دەردەچو بە ناوی ( الهداية ) و دەگەیشتە دەستی ئێمە و بڵاودەکرایەوە بەراستی ئیسلامی راستەقینەی تێدا شەرح دەکرا زۆر بەرێکی و جوانی .

سەرەتای کاری بێداربوونەوە پەیوەندی نیوان کوردستان و هەموو عێراق بەو شێوەیە بوو تا ساڵی ( ١٩٥٠ ) ز لەو کاتەدا مەرحوم شێخ صواف لە قاهیرەوە گەرایەوەو کەڵکێکی زوری لە ئەزهەری شەریف و صەحوەی ئیسلامی بەنناڵی وەرگرتبوو لە میسر ، هەتا بووە پشتیوان وپاڵپشت بۆ شێخی زهاوی و بە هەموو لایەکیانەوە دەستیان کرد بە بانگەواز و بێدارکردنەوەی ئەو خەلکە ، تا تەنگیان هەڵچنی بە حکومەتی ئەو سەردەمە ( و تەنانەت شەخصی (( وەصی )) ئەمریکی دەرکردبوو کە نابێت شێخی صواف بە هیچ شێوەیەك وتار بخوینیتەوە هەر بەم دەقە : (( لا تخلوا صواف يخطب )) ئەوە بوو وەك جاریکی تریش ئیشارەتم کرد بۆ ئەوەی

کە هەردوو مەرحوم شێخ امجدی زهـــاوی و شێخ صـواف سـەردانێکی هەلە بجەیـان کرد و هەر لە و کاتەوە پەیوەندی زیاتـر لە نێوان ئێمە و شیخ صـواف دا دامەزراو پتـەو بوو .

لێرەدا حەز دەکەم ئەوەش بلێم کە لـــە پێش ئەو کاتەیشـەوە ـ للە الحمد و المنة ـ لە ناوچەکەدا چەندەها کاری گرنگ کـــە خوا پێی خوش بێت کراوە و وە ( مُحَرّمات ) قەدە غە کراوە کە بە راستی ئا لەو کاتـــەدا جێگای تەقدیر بووەو لە هەمان کاتـــدا جێگای سەرسورمانیش بووە .

وە لە دوای مەرحوم باوکم هاورێکانـــی ئەو کە لەو کاتەدا ( ماموستا مەلا صالح ) ی گەورە برا گەورەیی دەکردین هەمـــان ریبازەکەی ئەوانمان گرتبووە بـــەر و بەردەوام بووین ، ئەمە لە لایەکەوە لـــە لایەکی ترەوە ئەو بیرو بوچوونە بەنرخانەی پاکەی کە لە گەل شیخ صـواف دا پەیمـان مـان لەسەر بەست زیاتر گەشەی پێ درا هەتا سـالی ( ١٩٥٨ ) ز شـورشـــی عبد الکریم قاسم هاتە کایەیەوە شیوعیەکـان وەك هەلێك بۆ خۆیان قوزتیانەوە ، هـــەر چەندە عبد الکریم قاسم خوی شیوعـــی نەبوو بەلام ئەوە بوو جمال عبد النـاصـــر دەستی خستبووە کاری سـوریاوە لـــە رێی ئەو کومارە یەکگرتووەی کـــە دروستیان کردبوو بە ناوی ( الجمهوریـة العربیة المتحدة ) ئەوە بوو عبد الناصـر هەمان فکرە دابووی لە کەللەی بۆ عیراقیش ئەمیش واتە ـ عبد الکریم قاســـم ـ شیوعیەکانی بەکار هێنا بۆ بەرگری لــە و فیکرەیەی عبد الناصر .

ئینجا ئەمەش دەلێم لە بابی ـ وتحدث بنعمـــة اللە ـ کە خوای گەورە یارمەتی ئێمـــەی داو دەستمان کرد بە موکافەحەکردنـــی ئەو بیرە گەندەل و بوچوونە ناپەسەندانـە ئیتر روزهەلاتی بونایە یا روژئاوایی تـــا ئەو کاتەی دوور خراینەوە بۆ ناصریـە .

هەروەها سـوپاس بۆ پەروەردگا ر کـــە یارمەتی و چاوەدێریەکەی بەردەوام بـــوو لەسەرمان لە کاتی بە عثـە یە کانیـش دا هەر کار و بانگەوازی خۆمان دەکـــر د و گوێمان نەدەدا بە هەرەشەو گورەشە و توقاندنی ئەوانیش ، هەتا جارێکی تـــر دووریان خستینەوە بۆ سماوە و رمیثـە و هیندی یە و حصیبە لە سەر سنووری سـوریا ئەمە و ئەو رووداوانەی کە بەسەر ئێمــە و بانگەوازەکەیش دا هاتن زورن و دریـــژەی دەویت بەلام تا ئیرە با بەس بی .

پرسیاری دووەم :

کەی وە چون بو یەکەم جار کاری ریکخستن وەستینرا و پەیوەندی پچرا ؟

جەنابی رابەری گشتی :ـ

دوای ئەوەی بەعسیەکان کودەتا شومەکە یان کردوو بە چنگیکی ئاسنین کورەیەکـــی ئاگرین حوکمی عیراقیان گرت بە دەستەوە ،دوای ماوەیەکی کەم و لە دەورانی قیادەی تازەدا لـــە پریکـا فەرمان درا بە وەستانی هەموو جـــورە جم و جولێك و کونەکردنەوەی ئابوونەو هەموو جورە یارمەتی یەکی تر ئەمەش بوو بە هــــوی سـەرەکی ئیختیلاف و دوبەرەکی ... چونکـــە کومەلێك هەر بە لایەوە وابوو کارکــــردن نابێت بوەستی و بانگێشەی خوا سـرەوتنـــی بۆ نی یە ، هەندێکی تریش گوایە گوێرایە لـــی فەرمانن و وایان بە باش دەزانـــی !!

پرسیاری سی یـەم :

لە دوای دەست کردنەوە بە کــاری ریکخستن ، پەیوەندی نیوان کاری کوردستانی و کاری عیراقی چون بوو ؟

جەنابی رابەری گشتی :-

ئەوەی پیویستە بوتریت ئەوەی کارکردن و بانگەواز کردن هەر نەوەستا تەنها ئـەوە بوو بەو فەرمانەی قیادە پەیوەندی کەم بـووەو پچرا ، بەلام هەر بەردەوام کاری ئیسلامـی هەنگاوی خوی دەنا و هەولی ئەوەیشـی دەدا بریانی بەغداد و جیگاکانی تریش لە ئاستـی پیویست دا هەنگاوی خویان بنین و چەنـد هەول و تەقەلایەکی دیاریش لەو بوارەوە دراوە.

پرسیاری چـوارەم :

دوای هیجرەت کردن چون و بـە چ شیوەیەك لەگەل برایان و سەرپەرشتیارانـی کاری ئیسلامی دا هەنگاوتان ناوە ؟

جەنابی رابەری گشتی : -

ئەوەی پیویستە بوتریت ئەوە یە بیـش هیجرەتیش ئیمە زور جار بەو برایانەمـان دەگوت کاروبار لە جی یەکەوە بو جی یە کـی تر دەگوریت ، چونکە هەر جی یەك هـەل و مەرجی تایبەتی خوی هەیە و مەرج نی یـە کاریك و شیوازی کاریك بسەپینین بە سـەر هەموو جیگاکاندا بە هاوسانی - هەلبەتـە هیجرەتیش لە هەل و مەرجیکی پر بە پـری خویدا کراوە .. داواکارین لە پەروەردگـار لی ی وەرگرتبیـن ، ئەوجا بە پیویستمـان زانی لەسـەر قاعیدەی ـ وامرهم شوری بینهم وە لەسـەر فەرمانی ـ و شاورهم فی الامر .. راویژم کرد بە زوربەی ئەو برایانەی کە هـاو فیکر و هاوکار و هاو سەنگەر بوویـن و دوای نیشان دانی کومەلە بەلگەیەکی شەرعـی و واقیعـی .. بەلام بە داخەوە ـ ئەوانیش بـە کومەلە تەئویلاتیکی دەست کرد و خو دزینـەوە لە حەق ، دوای نەفس و دوای کومەلە شتیکـی داتاشراوی تر کەوتن .

پرسـیاری پینجـەم :

لە دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامـی یەوە هەتا ئیستا چ شتیك لە چلەپوپـەدا دەبینـن ؟ وە کام شتانەیش تا ئیستا هـەر لاوازن ؟

جەنابی رابەری گشتی :-

ئیمە هەر لە سـەرەتای دەست پی کردنـی کارمانەوە خومان وە فەرمانبەریکی بچووکـی ئەم فەرمانە ئیلاهی یە دەزانین ( و اعدوا لهـم ما استطعتم من قوة ) وە ئەمەش بە واجبیکی شـەرعی دەزانین بە سەرشانی خومانەوە جـا بویە هەر لەو کاتەوە هەتا ئیستا عـەزم و ئیرادە و ئومید بە یارمەتی خودا و کولنـەدان و مرابطە و مثابر و مصابرە لە چلەپوپەی کـاری خومان دا دەبینیـن ، بی گومانە کـاری پیغەمبەرانیش کومەلیك پەرچ و کوسـب و بەربەستیان لەبەر دەم دابووە ، بویـان فەراهەم هیناون ...

ئیمەیش بی گومان ئەگەر چەنـد خالیکی لاوازیشمان بو بیت یان هەبیت شتیکی سروشتی یە و دیاردەیەکی سادەیە هەولـی تەواویشمان بو داوە و بویشی دە دەین تـا بە پشتیوانی خوا بتوانین وشەی حـەق و عەدالەت بگەیەنینە دوا رولەی ئە ( کەلـە ستەم دیدە رەش و رووت و ماف خوراوەمـان.

پرسیاری شە شـەم :

لەم یادە پیروزەدا ئاموژگاریتان بـــو ئیسلامی یەکانی کوردستان بە گشتی چی یە ؟

جەنابی رابەری گشتی :

ئاموژگاریمان ئەوە یە داوا لە هەمـــوو ئەو برا ئازیزانە و ، ئەو هاو فیکـــــــــرو هاو سەنگەرانە و هاو چارەنووسانەمان دەکەین کە بە دلێکی پر لە ئیخلاســەوە جم و جولێ خۆیان گەشە پێ بدەن و گەل زیاتر و زیاتر وریــا و بیدار بکەنەوە ، وەسیرەتە پاکەکـــــــەی پیغـــەمبەرە ئازیزەکەمان ( صلی الله علیه وسلم ) بکەینە دیاردەو سەر مەشق بۆ خۆمان و بـــۆ ئەو خەلکەش وە بە راستی تێیان بگەیەنین کـە کەرانەوە بۆ لای بەرنامەکەی ئەو مایــــــەی ســەرکەوتن و رزگاری یە ، ئەمەو با جارێك و چەند جارێکی تریش بە خۆمان دا بچینەوە و زیاتر کۆی رایەلێ ئەمری ( و اعتصموا بحبـل الله جمیعا ولا تفرقوا ) ببینن و جی بەجێی بکەیـــن . ئەمە هەندێك بوو لەو فەرمایشتە شیرین و پر بەرەکەتانەی جەنابی رابــــەری گشتی کە خۆی لە خۆی دا پەردە هەلمالینـــە لەسەر روخساری حەقیقەتەکان بە ئەسپایــی و بە هێمنی ، هەرچون واقیعێکی زینـــدووە و بە لگەیەکی میژوویی یە بۆ چوونە ناوو ناخـی راستی یەکان .. وە بۆ زیاتر تیگەیشتـــن و شی کردنەوەی ئەم راستی‌یانە چاوەروانـــی بە شێکی تر بن ئەگەر خوا مولەتمان بدات .

# هەواڵەکان



هەڵەبجەی شەهید: سەعات(١٠) ی سەر لە بەیانی رۆژی ٦شەمە بەرواری ١٩٩٥/٧/٣١ .. مەکتەبی سیاسی و شورای ناوەندی بزوتنەوەی ئیسلامی لەشاری هەڵەبجەی شەهید کۆبونەوەی ئاسایی خۆی بەســت لەو کۆبوونەوەیەدا بە تێرو تەسەلی باس لە داهاتووی بزوتنەوەی ئیسلامـــــی و پێداویستی‌یەکانی قۆناغی ئیستا کرا .

هەروەها بارو دۆخی کوردستان بەگشتی لەو کوبوونەوەیەدا خرایە بەر باس و لێکۆ-لینەوە .. شایانی باسە لێکۆلینەوەکـــە تا نیوەرۆ درێژەی کێشاو سەعات (٢)ی پاش نیوەرۆی هەمان رۆژ دەستی پێ کردەوە و تا سەعات (٦)ی سەر لە ئێوارە بەردەوام بوو .

— رۆژی شەمە بەرواری ١٩٩٥/٧/٢٩ .. پەیامنێری رۆژنامەی سەلام و کەنالـــی حەوتی تەلەفزیۆنی تورکیا .. چاوپێکەوتنی لەگەل بەرێز ماموستا مەلا عوسمان عبد - العزیز .. رابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی ساز دا .

لەو چاوپێکەوتنەدا بەڕێز ڕابەری... گشتی ڕوونی کردەوە کە بزوتنەوەی ئیسلامی بزوتنەوەیەکی خوایی یەو درێژەپێ دەری ڕێبازی پێغەمبەری ئازیزمانە.. وەبەڕێزی ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە ڕابوونی ئیسلامی لە کوردستان دا .. سەرەڕای نەبوون وەیا کەمی توانای دارایی .. بە گوێرەی پێویست ڕۆژ بەڕۆژ لە پێشکەوتن و پەرەسەندن دایە و هەنگاوی زۆر باشی لە هەموو بوارەکاندا هاویشتووە وە گوتی : کە بزوتنەوەی..... ئیسلامی کە بەرنامەیەکی خواییە بۆتە مایەی ئومێدی گەلە موسڵمانەکەمان.....

پاش ئەم چاو پێکەوتنە پەیامنێرەکە سەردانی بەڕێز ماموستا مەلا علی عبدالعزیز جێگری ڕابەری گشتی و بەرپرسی کاروباری عەسکەری کرد لەو چاوپێکەوتنەدا بەڕێزیان هەوڵە ئاشتی خوازەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی گەلی موسڵمانی کورد ڕوون کردەوە .

پاشان پەیامنێری ڕۆژنامەی سەلام و کەناڵی حەوتی تەلەفزیۆنی تورکیا

لە چاوپێکەوتنێکی تردا چەند پرسیارێکی سەبارەت بەهەندێ مەسەلەی جیا جیا ئاراستەی بەڕێز ماموستا ئەحمەد کاکە محمود ئەندامی مەکتەبی سیاسی و لێپرسراوی نوسینگەی ڕاگەیاندن کرد.. بەڕێزیشی بە تێرو تەسەلی وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە .

هەورامان / ڕۆژی هەینی بەروار ی ١٩٩٥/٧/٢٨ بەڕێز ماموستا سەید نوێنەری حیزبی ڕەفاهی تورکیا سەردانی بەڕێز ماموستا عوسمان عبدالعزیز ڕابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی لە بارەگای تایبەتی بەڕێزی لە هەورامان کرد وە لەدیدارێک دا کە بەڕێزان ماموستا علی عبدالعزیز .. جێگری ڕابەری گشتی و ماموستا ئەحمەدی کاکە محمود و کاک کاملی حاجی علی .. و کاک دکتورابراهیم ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و مامۆستا عبدالغنی و کاک ئازاد حوجرانی ئەنداما -نی سەرکردایەتی ئامادەی بوون باس لە چونێتی بەرەو پێش بردنی کاری ئیسلامی و بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان کرا.

هەولێر : سەعات(٦) ی سەرلە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٩٥/٧/٢٣ بەڕێز کاک محمدی حاجی محمود سکرتێری حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان .. بە یاوەری بەڕێزان کاک صابیرو ماموستا سەلام ئەندامانی سەرکردایەتی و کاک سلێمان ئەندامی بەشی پەیوەندی یەکانی حیزب .. لەشاری هەولێر سەردانی بارەگای مەڵبەندی چواری بزوتنەوەی.... ئیسلامی کرد .. لەلایەن بەڕێزان کاک دکتور ئیبراهیم ئەندامی مەکتەبی سیاسی و ماموستا عبداللەی قەسری لێپرسراوی مەڵبەندی چوارو کاک سەلیم ئەندامی مەڵبەند بەگەرمی پێشوازییان لێ کرا وە لە دانیشتنێک دا باس لە پەیوەندی دۆستانەی نێوان هەردوولاو بارودۆخی کوردستان کرا .

سلێمانی / ڕۆژی ٢شەمە بەروار ی ١٩٩٥/٧/٢٤ سەعات (٨/٣٠ )ی سەر لە بەیانی بە کاتی هاوینە ، بەڕێز دکتۆر محمود عوسمان سیاسەت مەداری ناسراوی کورد سەردانی بارەگای مەڵبەندی سلێمانی بزوتنەوەی ئیسلامی کردو لەلایەن بەڕێزان مامۆستا شێخ محمدی بەرزنجی ئەندامی مەکتەبی سیاسی و مامۆستا عبدالرحمن نەورەسی لێپرسراوی مەڵبەند پێشوازی.. گەرمی لێ کرا.

پاشان لە دانیشتنێک دا بارودۆخی کوردستان و بەردەوام بوونی شەڕی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان .. لەگەڵ چونێتی ڕاگرتنی ئەوشەرە . کورد کوژی یە خرایە بەرباس و لێکوڵینەوە .. لەوبارەوەبەڕێز د کتۆر محمود عوسمان سوپاس و ستایشی هەوڵە ئاشتی خوازەکانی بزوتنەوەی ئیسلامی کرد .

دهۆک / رۆژی یەک شەمە ٩٥/٧/٢٩ لە بارەگای مەڵبەندی پێنجی بزوتنەوەی ئیسلامی لە شاری دهۆک .. بەبۆنەی.... کۆتایی هاتنی خولی سەربازی و شەرعی و کاراتی ئاهەنگێکی گەورە ساز کرا لەسەرەتای ئاهەنگەکەدا .. چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز خوێنرایەوە.

پاشان وتاری مەڵبەند لە لایەن بەرێز مامۆستا سەید عەلی .لە جێگری لێپرسراوی مەڵبەند پێشکەش کرا پاشان تیپی سرودی دەنگدانەوەی شاری زاخو سرودێکیان پێشکەش کرد .لە دوایدا شانۆگەری ( فەقیری و رێک خراوە.. تەبشیری یەکان لەلایەن تیپی دەنگدانەوەوە پێشکەش کرا.. لە کۆتایی ئاهەنگەکەدا....... خەڵات بەسەر بەشدار بوانی هەرسێ خولەکە دابەش کرا

بەغداد / لە بەغداد رۆژنامەی بابل کە عودەی کوری تاغوت سەرپەرشتی دەکات لە ژمارەی روژی هەینی رابووردوودا بلاوی- کردەوە کە عێراق ئامادەیە هەموو زانیاری یەکانی تایبەت بە دامەزراوە جەک سازی - یەکان بخاتە بەردەستی پسپورە نیو دەوڵەتی یەکان ، بۆ رازی کردنی نەتەوە یەککرتووەکان بەلابردنی گەمارۆی ئابوور ی لەسەر بەغداد...

رۆژنامەکە ئاماژەی کردووە بۆ ئەوەی کە رژێم نیازی وایە ئەوپەری هاوکا ری...... ( رولف ئیکیوس ) ی سەرۆکی لیژنە ی لەناوبردنی چەکە کۆ کوژەکانی عێراق لە کاتی سەردانی ناوبراو بو بەغداد کە بریار وایە لە هەفتەی داهاتوودا ئەنجام بدرێت

شایانی باسە ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی سوورە لەسەر هێشتنەوەی... گەمارۆی ئابووری لە سەر رژێمی بەغدادتا ئەو کاتەی پسپورەکان دلنیادەبن لە لەناو بردنی تەواوی چەکە کۆ کوژەکا نی ئەو رژێمە

لەلایەکی ترەوە رێکخراوی ( میدل‌ئیست وچ ) کە تایبەتە بەبەرگری کردن لە مافی



( رۆلیف ئیکیوس)

مرۆڤ هەفتەی رابوودوو داوای لە عێراق کرد چارەنوسی ئەو هەزار هاو ولاتی یە کوێتی یە ئاشکرا بکات ، کە لەکاتی داگیر کردنی ولاتەکەیاندا بێ سەرو شوێنن .

رێکخراوەکە لە نامەیەکدا کەئاراستەی بالوێزی رژێمی بەغدای لەنەتەوە یەکگرتووە - کان کردووە کە هاوکاری لەکەڵ ئەو لیژنانە دا بکات .. کە بو لێکولینەوە لە چارەنوسی ئەو گیراوانە پێک هێنراون ..

ئەمەستین / لە کەرتی غەزەی فەلەستینی داگیر کراو بزوتنەوەی ئیسلامی حەماس روون کردنەوەیەکی بلاو کردەوە کە تیایدا هەواڵی رفاندنی دوو هاو ولاتی ئەمریکایی لەلایەن.. بزوتنەوەکەوە بە درۆ خستەوە.

حەماس لە روون کردنەوەکەیدا رای‌کەیا - ندووە کە ئامانجی سەرەکی لەبلاوکردنە - وەی ئەو جۆرە هەوالانە .. ناشیرین کردنی شێوەی بزوتنەوەی حماسە لەبەر چاوی رای گشتی جیهانی ..

شایانی باسە رادیۆی ئەوارەی زایۆنی پێشتر رای گەیاندبووکە بزوتنەوەی حەماس دوو هاو ولاتی ئەمریکایی رفاندووە لەتولەی دەستگیرکردنی ( موسی‌ابو مر زوق) کەیەکێکە لە سەرکردەکانی حەماس و هەفتەی رابووردو لە فروکە خانەیەکی ئەمریکا دەستگیر کرا هەر لەو بارەوە سەرچاوەیەکی هەواڵلە

شاری قودس رای گەیاند کە لێپرسراوانی قەوارەی زایونی نیازیان وایە داوا لە ئەمریکا بکەن بو تەسلیم کردنی ئە...و مەرزوق... بە تەل ئەبیب .. بەلام بزوتنەوە حەماس لە بەیانێکدا رژیمی زایونی و حکومەتی ئەمریکای لەسەر ئەنجامی ئەو جورە کارە ئاگادار کردەوەو لە نامەیەکیشدا بو بیل کلنتون ی‌سەروکی ئەمریکا .. داوای.. ئازاد کردنی موسی ابو مەرزوقی کرد.





زایونی لەو هێرشەدا کوژراوەو دوو سەربازی تریش بەخەستی بریندار بوون .. بەپێی هەواڵ زایونی یەکان دوای ئەم هێرشە وەک پیشەی هەمیشەیی خویان دەستیان کرد بە توپ باران کردنی کوندە ئازاد کراوەکانی باشووری لوبنان

**میسر :-**

سەرچاوەکانی هەواڵ لە میسرەوە رایانگەیاند کە هێزەکانی پۆلیسی رژێمی قاهیرە لە شالاوێکی بەرفراوندا هەستاون بە دەستگیرکردنی ( ٢٠٠ ) ئەندامی چالاکی رێکخراوی ( الاخوان المسلمین ) لە نزیك شاری ( الاسکندریة ) وەزارەتی ناوخۆی ئەو ولاتە بیانوی ئەنجامدانی ئەو شالاوەی گەراندەوە بۆ هاوکاری کردنی ئەو ئەندامانەی رێکخراوەکە لەگەڵ موجاهیدانی چەکداری میسر شایانی باسە هەرچەندە رێکخراوی ( الاخوان المسلمین ) لە میسر تا ئێستا چەند جارێك لە بۆنەی جیا جیادا نارەزایی و بێ بەری خۆیان لە چالاکی یە جیهادی یەکان راگەیاندووە بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هێزە سەرکوت کەرەکانی رژێمی قاهیرە ناو بە ناو لە روانگەی سیاسەتی دژایەتی کردنی ئیسلام و ئیسلامی یەکان شالاوی لەم جۆرە دەکەنە سەر ئەندامانی ئەو رێکخراوەو راپێچی زیندانیەکانیان دەکەن .

باشوری لوبنان / رێکخراوی حزب‌الله لوبنان لە بەیاننامەیەکدا کە لەباشوور ی لوبنان بلاو کرایەوە رای گەیاند موجاهیدانی رێکخراوەکە لەد ریزەی چالاکی یەکانیا لە دژی هێزە داگیر کەرەکانی رژێمی زایۆنی بەکری گیراوەکانی هیرشیان کردوتە سەر دەوری یەیەکی سەربازی ئەو هێزانە.لە ناو - چەی پشتینەی ئەمنی داگیر کراودا .. لە بەیاننامەکەی حیزب اللەدا هاتووە لەو چالاکی یەدا ژمارەیەک لەسەربازانی‌دەوریەکە کوژراون وە یاخود بریندار بوون ...

لە هەمان کاتدا لێپرسراوێکی هێزە داگیرکەرەکان لە باشووری لوبنان لەلیدوان - ێک دا وێرای دان نان بە روودانی هێرشە - کە رای گەیاند کە سەربازێکی سوپای......



**کۆماری بوسنە :-**

هاوکات لەگەڵ بەردەوام بوونی شەر و پێکدادان لە نێوان هێزە موسڵمانەکانی حکومەتی بوسنە و هێزە درندەکانی صرب لە چەند ناوچەیەکی جیاجیای ئەو کۆمارەدا لە سەرەتای ئەم هەفتەدا هێزە سەربازەکانی کۆماری کرواتیا هێرشێکی بەربلاویان بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەستی صربەکان لە خۆرئاوای کوماری بوسنە دەست پێ کرد وە بە پێی هەواڵ کرواتیەکان توانیویانە روبەرێکی فراوان لەو ناوچەیەدا لە صربەکان پاك بکەنەوە یەکێك لە و ناوچە رزگار کراوانە بریتی یە لە شارۆچکەی ستراتیژی (کراتچوڤو) کە ناوچەکانی ژێر دەستی صربەکان لە خۆرئاوای بوسنە دەبەستێتەوە بە هەرێمی کراینای کۆماری کرواتیا کە صربەکانی ئەو کۆمارە ولاتێکی سەربەخۆی صربی یان تیادا دروست کردووە هەر لەو بارەوە ئاژانسی دەنگ و باسی رۆیتەر رایگەیاند کە سوپای کرواتیا دوای بە دەست هێنانی ئەو سەرکەوتنانە بەسەر صربەکانەوە هێرشەکانیان بۆ سەر هەرێمی کراینە دەست پێ کردووە لە هەمان کات دا لە شاری بیهاج هێزە موسڵمانەکانی حکومەتی بوسنە بەرپەرچی چەند هێرشێکی صربەکانیان دایەوە و زیانی زۆریان پێ گەیاندن وە لە شاری (جیپا) کە دوو هەفتە لەمەوبەر لە لایەن صربەکان داگیرکرا هەواڵەکان رایانگەیاند کە درندەکانی صرب هەستاون بە تالان کردن و سوتاندنی خانوو بەرەکانی ئەو شارۆچکەیە ، لە لایەکی ترەوە لە سەرایڤو عەلی ئەکبر ولایەتی وەزیری دەرەوەی کوماری ئیسلامی ئیران لە چوارچێوەی سەردانێکی بۆ کۆماری بۆسنە لەگەڵ عەلی عیززەت بیکوفیجی سەرکۆماری بۆسنە کۆبۆوە لەو کوبونەوە یە باس لە چۆنیەتی یارمەتی دانی موسڵمانانی کۆماری بۆسنە لە لایەن وولاتە ئیسلامی یەکان کرا هەروەها هەردوو لا لە بەیانێکی هاوبەشدا داویان لە نەتەوە یەککرتوەکان کرد کەمارۆی چەك لەسەر حکومەتی بۆسنە هەڵبگرن .

**چیچان :-**

لە شاری (کرۆزنی) پایتەختی کۆماری سەربەخۆیی خوازی چیچان نوێنەرانی سەربەخۆیی خوازەکانی ئەو کۆمارە و حکومەتی روسیا لە درێژەی وتووێژەکانیان دا رێکەوتن نامەیەکی سەربازی یان ئیمزا کرد ، بە پێی ئەو رێکەوتن نامەیە هەردوو لا دەست بەجێ چالاکی یە سەربازی یەکان دەوەستێنن هەروەها یەکێك لە بەندەکانی رێکەوتن نامەکە داوای گۆرینەوەی دیلەکانی شەر دەکا .
هەرچەندە چاو دێرەکان ئیمزاکردنی ئەو رێکەوتن نامەیان بە هەنگاوێکی گرنگ لە قەلەم داوە بەلام کێشەی سەرەکی لە وتووێژەکانی نێوان چیچانی یەکان و حکومەتی موسکو کە بریتی یە لە دیاری کردنی ئایندەی سیاسی کۆماری چیچان تا ئێستا بێ چارەسەر ماوەتەوە بریار وایە ئەم مەسەلەیە لە کۆتایی ئەم هەفتە دا و لە خولێکی تازەی وتووێژدا کە لە ئاستیکی نزم دا ئەنجام دەدرێت باس بکرێت .





# دانیشتنێکی کورت لەگەڵ وەرزێری شاعیردا

گۆڤاری جەماوەر : سەرەتای شیعر گوتنت
کەی و چۆن دەستی پێ کرد ؟

وەرزێر : بەناوی خوای بەبەزەیی و بەخشندە....
پێش وەخت دەبێ بڵێم سوپاستا دەکەم کە بەر بینگتان پێ گرتم کە ئەو چاو پێکەوتنەم پێ ساز بدەن..

با بێینە سەر وەڵامی پرسیارەکە :
سەرەتای دەست پێ کردن و پەیوەندی بەستنم لەگەڵ شیعردا دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هەشتاکان ، دوای ئەوەی لە(٧٨) کە بەعسیە بێ دینەکان لە پشدەردەستیان کرد بە ڕا گواستنی گوندەکان و گوندی ئێمەش یەکێک بوو لەو گوندانەوبردیانین لە ئوردوگای" توە سوران" هەڵیان ڕشتینو کەوتینە نێو ژیانی کولە مەرگی و بێنازیو نارەحەتی بەوە و باوکم کە پێشترسەروکاری لەگەڵ شیعر دا نەبوو... لەوێ دەستی لە شیعر نوسین وەرداو زۆریش کەیفی بە شریتی شیعرەکانی ( قانیع) دەهات کە لەگەڵ شمشالێ( قالە مەرە) لێدەدران و بۆ خۆشی بەشێک لە شیعرەکانی کەزۆربەی بریتی بوون لە یادو بیرەوەریەکانی خۆی ... لە نێو دۆستانی دا بەشریت بڵاو دەکردنەوە ،



بەڵێ ئەمە کارینەری یەکی نەواوی هەبوو بەسەر وروژاندنی ئیلهامی ........ شیعریمەوە .. وە دەتوانم بڵێم لەوێرا ... ئیلهامی من جترووزەی کردوو .. شەریەک لە چاوپێکەوتنێکی تر لەگەڵ کۆڤاری دەنگی باوەڕ دا لە ساڵانی(٨١ و ٨٢) دەستم کرد بە شیعر نوسین ... لەسەرەتادا شیعرەکان وەک خۆم پلتۆخ بوونو دەگەڵ زیاتر ڕۆشن بوونەوەی دڵ و چاوم بەنووری هیدایەتی خوا ،

شیعرەکانیش وەک منداڵی حیکایەتی هەر یەک ڕۆژەی دوو ڕۆژەبوون.

کوڤاری جەماوەر : رابوونی ئیسلامی ============= ئەمرۆ لە کوردستان و هەموو وڵاتە ئیسلامی یەکان ... بوونی ئەم ڕابوونە چۆن هەڵدەسەنگێنن ؟

وەرزێر : رابوونی ئیسلامی یانی ———— گەرانەوە سەر خۆ و بوژانەوەی ئیمان و ڕۆشن بوونەوەی بیرو زەینی ئیمانداران هیچ نکوڵی یەک لە هەقیقەتی دەقەکانی ئیسلام نییە.. ئەوەی دەبێ کاری بۆ بکرێ ، بێگومان دنەدانی ئیمان دارانە بۆ ئیلتزام بە دەقەکانەوە

حەتمەن هەر کاتێکیش ئیلتزام هەبێ مانای هەبوونی رابوونی ئیسلامیدەگەیەنێ ئەمرۆ سوپاس بۆ خوا رابوونی ئیسلامی یا بە واتایەکی تر.. گەرانەوە سەرخۆ و .. بوژانەوەی ئیمان و ڕۆشن بوونەوەی بیر و زەینی ئیمانداران لە وڵاتانی ئیسلامی و کوردستانی ئێمەش دا زۆر فراوانە بەڵگەی فراژوبوونیشی دڵ تێکەدەهاتنی گەورە هێزە دنیاخۆرو کلک وگوێیە ناوچەیی و ناوخوییەکانمانە پێی .

کۆڤاری جەماوەر : بزوتنەوەی ئیسلامی ============= چۆن دەبینی؟ ئایا بزوتنەوە چی بکات بۆ ئەوەی لە داهاتوودا خەلک پەروەردە بکات .؟

وەرزێر : من بۆ خۆم سوپاس ———— بۆ خوا لەسەر ئەو نیعمەتە، ئەوە مووم لەم بزوتنەوە... ئیسلامی یەدا سپی کردن.لە خوای بەزیاد بێ کەلێک تۆناغی چاکی بریوون.

ئەگەر لەوەش وورد بینەوە داخۆ هەڵەو ناتەواوی هەبوون یان نا، دەبێ بڵێین : پێغەمبەری پیشەوامان - صلی‌الله علیه‌وسلم- دەفەرموی:( کل بنی ادم خطاؤن)

ئەدی مەگەر بزوتنەوەش هەر لەم ئادەمیزادانە پێک نەهاتووە ؟!! بەڵکو ئەو بەو پێیە هەڵەی حەشاماتێک وەخۆ دەگرێ هەڵە هەبوون ، عەجایب نییەو کەسیش ناتوانێ لێی بەدەربێ ، بەلکو ئەوەی ئافاتی پێوەیە بۆ هەر تاک و کۆمەڵێک سووربوونە لەسەر هەڵەو نەگەرانەوە .

سەرخەت و سەرە ڕۆیی یە، سیارە ئیرادەو جورئەت و جوامێریش لە بزوتنەوە دا لەو ئافاتە باڵا ترو بەهێز ترە بزوتنەوە پرۆژەیەکی زیندوویە ، حەرەکەو لەحەرەکەدا ، شەرع و مەنهەجی هەیە و کاروانێکە و گەلێ ڕێگای عاسێی بریون.. زۆردەورانی سەختی دیون.. جاران لە تەجرەبەدا ساوا بوو ، ئێستا سوپاس بۆ خوا چەند جار لە گڵ ئاتۆتە دەرو عەگبەی تەجرەبانی پێیە، بۆیە هەر کەسێک پێی وابێ ڕۆژێک دێ فاتیحای بۆ بخوێنی ئەو کفنی بۆ دەبری .

سەبارەت بە پەروەردەکردنی خەلک -یش بۆ بزوتنەوە هیچ شتێک لەکردنەوە دەوراتی شەرعی و عەسکەری و سیاسی و گرنگی دان بە تەخەصوصات باشتر نییە

جا کەسانێک کەلەو بوارانەداشارەزایی پەیدا دەکەن و درێژەش بە خەبات و جیهاد -دی خۆیان دەدەن و تەجروبەی(عملی ) -یش کە جیهادە و جیهادیش گەورەترین دانشگایە .. تێیدا پێ دەگەن، بە لێ بە حەق کەسانێکی ئاوا دەبنە جێگای پشت پێ بەستن و پیاوی دوارۆژی بزوتنەوە

گۆڤاری جەماوەر : چۆن دەروانیتە موجاهیدێکی بزوتنەوە لە گەرمەی شەری تولەسەندنەوە دا ...؟

وەرزێر : موجاهید یانی پیشمەرگە ـ کەی دەست بەدەنویژ.. ئەوە هەر بۆ خۆی بایەخێکی گەورە هەیەو ئەگەر ئاگاداری خۆی بێت.رووسوری دنیاو دوا رۆژەو کەس وەخۆی وە پێش نادا ـ تەوە ، موجاهید لەشەری تولەدا لە دوو لاوە ئایەتی خوا جێ بەجێ دەکات لەم لا ئایەتی( قتال) وەلەولا ئایەتی ( قصاص) ....

خوا نافەرموێ لە خۆرا یەخەی کەس بگرە ، بەلام کە شەریان پێ فرۆشتی سەنگەر بگرەو .. ئەگەر ستەمیان لێکردی ئازابەو تۆلە وەستێنە .

پێشمەرگەی سەنگەری تۆلە هێندە مەحبوب و بەرێزە بۆ یێ دەبێ دەست و نێو چاوانی ماچ کەی.. یەکێک لە ناوەکانی خواش ( منتقم ) ە .

گۆڤاری جەماوەر : ئەدەبی ئیسلامی رەسەن دەبێ چۆن بێت ؟ ،

وەرزێر : ئەدەبی ئیسلامی رەسەن ئەوئەدەبەیە کە لە ژێر تیشکی بیرو باوەری ئیسلام و ئیسلامێکی( محمد ) یانە ی سەرتاپا گیری هەمە لایەنەدا ، وەک یەکێک لە شێوازەکانی بانگەوازی بە شێوەیەکی کراوەو زیندوو دادەبەزێتە مەیدانەکانی واقیعەوە .

گۆڤاری جەماوەر : شیعر چییەو کێ شاعیرە ؟

وەرزێر : شیعر ئیلهامە و تایبەتمەندی خۆشی هەن ، من نکولێم لە داهێنان نییە لە شیعردا ، بەلام چۆن کالەک نابێتە شوتی ، ئاواش چیرۆک و پەخشان و حەیران و لاوک و حیکایەت نابنە شیعر .

شیعریک کە بەیەکجاری لە کێش و سەروا ئاوەڕووت کرابێ .. بێنە لە شێوە نوسینی ئاسایی و پەخشان بینوسەوە ، نیشانی هەرکەسێکی بدەی یەکسەر دەڵێ بەخوا پەخشانێکی جوانە !

سەبارەت بە شاعیریش .. هەیە شیعر دۆستەو هەیە هەستی شیعری هەیەو هەشمانە شیعر نووسە.. ئەمانە هەموو قۆناغەسەرەتا ـ یی یەکانی شاعیرین..

ئەوی ئەمانەی هەلبواردن دەبێتە شاعیر .. دیارە شاعیریش شتێکی نیسبی یە شاعیر کە لە سەرەتادا ئیلهامی شیعری.... هەیە ، کاری بەوەندە تەواو نابێ ،، بەلکو هەرکام لە ( رەغبەت و دەست بەکاربوون و کولنەدان ) لە پێداویستی یەکانی شاعیرن.

گۆڤاری جەماوەر : ئایا پەیوەندیو تێکەلاویت دەگەل ... گۆرانیدا چۆن بوو داخوا شیعرت بۆ نوسیوە ؟

وەرزێر : تا دوای راپەرین کەسێکم نەدەناسی بەناوی ( گۆرانی ) دوایی کە بەدیداری شادبوو م دۆستی یەکتر بووین و بێجگە لە رێز و

خۆشەویستی بۆ یەکترمان نەبوو.. زۆر جار شیعری بۆ دەخویندمەوەو ئەمنیش جـــار جارە ئەوم دێشاند ، برای بەرێزم کـــاک ( کوساری شەهید ) سەرباری ئەو هەموو.... بەهرە بەپێزە .. کەچی بەداخەوە بێ نـــاز بوو، وەک پێویست نازی نەدەدرایـــــــــە

بەڕاستی کاک کۆساری پێش شەهیـــد بوونی لە مەیدانی شیعردا ئەسپی خۆی تـا ئەو پەر تاو دابوو، زۆر دائێنەرانـــــەو جوامێرانەو بە جورئەتەوە دەئەڵ ڕوودا وە ڕاستی یەکاندا دەستەملان ببوو.

ئەو هەمیشە دەیکوت:

( دەبێ ئەدەبی ئیمە زۆر لە ئەدەبی کوفر و لا ڕیـوی بالاتر بێ ).

بـەحەق ئەو ئەمەی لە خودا ئێنایـە دی و کەس ناتوانێ نکوڵی هەبێ لە کەورەی شیعرەکانی ئەو .

وە بۆ ئەم خۆشەویستە شیعرم نوسیوە و ئەمە نمونەیەکیانــە : -

(( تـاوانـی بنیادەمـی گێـل ))

کە ئاژانســی دەنگ و باســی
ئیمپـراطـوری شـیعرو وشـــە
هـەواڵـی کۆچی کۆســـاری
بە قـەندیـل و سەفین گەیانـد
( خانـی) لە جیاتی( مەم و زین )
داستانێکی دی نوسـیەوە
لـە ژێـر ناوی : -
تـاوانـی بنیادەمـی گێـل
( نالی ) یش لـە شـارەزوورەوە
( بوردە) ی خۆی بۆ کردە کفن و
( شێخ محمود) یـش
بڕنـەوەکەی بۆ کرد، گێـل .

**گۆڤاری جەماوەر : دەربارەی شەری خۆکوژ**
============= ک - کوردستان چـــی دەڵێی ؟

وەرزیـــــــــــر : چا کاکە چ بڵێم ....... دەربارەی ئەو بەلایە .

دەک خوا غەزەبی لەوەی بگرێ کە ئەم جەهەنەمە ، بێ میللەت داخست، نەجارێکە و نەدوو جار .. نەساڵێکەو نەدووساڵ.. کـە ئەم خاک و میللەت و خەباتە بە بریــــارە نەفسی و شەیتانی یەکان لەدار دەدرێـن و دەکولێنرێن..

ئاخر توخوا ئەوە کەنگێ بوو بە خەبات و کوردایەتی و ئاوەدان کردنەوەو خزمەت .

بێگومان ئەوەی نەک هەر زەرەری تێدا دەکات بگرە تێشی دا لەبەین دەچێ.. هـــەر میللەتەو کەسی دی نـــا ...

ئەویش ئەگەر بۆ خۆی خەمێ لە خـــۆ نەخوات .. ئەوە ئەوان بەزەیی یان پیـــدا نایەتەوەو چاکیان بۆ هاتووە و چاک دەیخۆن بەلێ ئەمەیە کوردایەتی بیردوزە(مستورد ) ەکـان ! ،



# بەرەو ڕاگەیاندنێکی ئیسلامی ڕەسەن

«بەشی چوارەم»

نووسینی: محمد حسن

بەرەو ڕاگەیاندنیکی ئیسلامی ڕەسەن
بەشی چوارەم
چۆن دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمـــا ی ئیسلا می دا بمەزرێنیـــن ؟

ئەگەر وا بزانرێت کە ڕاگەیاندنی ئەمڕ و بە هەموو دەزگا و شێوازەکانی یـــــەوە هونەرێکی تازەیە ، ئەوا دەبێت ئەو ڕاستییە لەبیر نەکرێت کە ئەم بۆچوونە بە نیسبـەت ئیسلام و ئوممەتی ئیسلامیەوە وا نەبـووە و واش نی یە ، چونکە ئیسلام هەر لە سەرەتـا ی دەست پێکردنی‌یەوە ڕاگەیاندنی بـووە و هیچ کەم کوڕی یەکیشی تێدا نەبووە ، بەڵکو ئیسلام داهێنەری شێوازی تازە و کاریگەریش بـووە لە ڕاگەیاندن و هونەری ڕاگەیاندنی دا ،چونکە دەست پێکردنی ئیسلام لەسەر بناغەی وشەی ڕاست و زمانی ڕاستگۆ بووە ، لە هەمان کاتدا لەسەرکردەوەی چاك و بێ لەکە و بێ هیـــچ فرت و فێڵێك ، قورئان خۆی بەڵگەیەکی بەهێز ی ئەو ڕاگەیاندنە بووە ، وە سەلمێنەری ڕاستـی و دروستی پەیامەکەی پێغەمبەر ( صلی اللـــه علیه وسلم ) بووە ، ئەو پەیامەی کـــــه لەوپەڕی ڕەوانبێژی و جوان ڕوخســـاری و شکۆداری دابووە ، کە تەحەدای هەمـــوو جیهانیانی پێکراوە و پێی دەکرێ ج ئینســان بن ج پەری ....

هەر ئیسلام بووە داهێنەری چەندەها شێوازی ڕاگەیاندنی تازەکە ئەو خەڵکە لێی بێ ئاگا بوون و هەر بە لای دا نەچوون، کە تازە ئەو خەڵکە بەرزی و بە هێزی ئەو داهێنانە سەرکەوتووانەیان بۆ دەردەکەویت ، کە توانیویەتی ڕاستی نەقڵ کردن و ڕاستگۆیی لە خەبەردا و ووردی و دروستی لە کاردا فێری ئەو خەڵکە بکات .

هەر کەسێك بیەوێت ئەسپی خۆی لە مەیدانی دیراسەی ڕاگەیاندن دا تاو بدات ، بە درێژایی مێژوو دەگاتە ئەو قەناعەت و دڵنیاییە کە ئیسلام خاوەنی تۆمارێکی دەوڵەمەند و توێشووبەکی نەبراوەیە لە بواری ڕاگەیاندن دا ....

هەتا زەمانەیش بێت و بڕوات و هۆکاری جیاجیا و کەناڵی جۆراو جۆریش بدۆزرێتەوە ئەوا لێکۆڵینەوە زانستی یە تازەکان ئەوەمان پێ دەسەلمێنن کە هەمان ئەو هوکارو کەناڵە جیاجیایانەی ئەمڕو بە کار دەهێنرێن لە رابوردودا ئیسلام بەکاری هێناون کەواتە شتێکی نامۆ و گران نی یە کاتێك بمانەوێت دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای ئیسلامی دابمەزرێنین ، بە شێوەیەك کە ببێتە یارمەتی دەرو پاڵپێوەنەر بۆ چەسپاندنی عەقیدە و بڵاوکردنەوەی ئەخلاقی جوان و ، گەشەپێ کردنی ڕۆشنبیری و صیاغەکردن و دارشتنەوەی ئەقڵیەتێکی واقیعی لە بواری ڕاگەیاندن دا....

خوێنەری بەڕێز ئەوەی کە زۆر پیویستە بوترێت بۆ ئەوەی زیاتر بە ناوە ڕوکی باسەکەدا ڕۆ بچین و ناخ و کاکڵەمان دەست کەوێت و بگەینە بنج و بناوانی دەبێت شێوازی دامەزراندن و دارشتنەوەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەرانبەرەکەمان بزانین و تێی بگەین و بە هەمە لایەنی دیراسەی بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە کاتێ چۆنیەتی دارشتن و دامەزراندنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای ئیسلامی بە هەمان چەکی دوژمنەکەمان ئێمەیش بجەنگین بۆ ئەوەی هاوکێشەو هاوسەنگ و جەنگەکەمان لەگەڵ دوژمنمان لا سەنگ نەبێت و ئێمە تیایدا نەدۆڕێنین ، هەر بۆ ئەم مەبەستە پێویستە بە وردی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دوژمن و هۆکارەکانی و شێوازەکانی و هەنگاوەکانیان بە وردی تێ بگەین تا بتوانین لە ئاستی جێ بەجێ کردنی ئەم ئەرکە گەورەو گرانەدا خۆمان ببینینەوە ، بۆ ئەمەش پێویستمان بەوە هەیە کە لە هەموو هەنگاوو پیلان و نەخشە و کارەکانی دوژمن بگەین لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنیاندا[1] ... ئەمەش پێویستی بە بە شێکی تایبەتی هەیە کە بە پشتیوانی پەروەردگار لە بەشی پێنجەمی ئەم باسەدا دەیخەینە بەرچاوی خوێنەری ئازیز و جەماوەری دڵسۆزی جەماوەر ...

کەواتە با ئێستا بزانین چۆن دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای ئیسلامی دادەڕێژین و دای دەمەزرێنین .. بۆ ئەمەش پێویستیمان بەوە یە کە ئێمەی ئیسلامی دوو جۆرە ڕاگەیاندنمان دەوێت و دەبێت بمان بێت :

یەکەم :-

ڕاگەیاندنی ناوخۆیی .. کە ئەمەش تایبەتە بە ئیسلامیەکانەوە کە دەبێت زۆر بە هێز و پێز و هەمە لایەنی بێت و بتوانێت صیاغەی شەخصیەتی ئیسلامی نموونەیی بکات بۆ ئەوەی بتوانێت هەڵسێ بەو ئەرکە پیرۆز و گەورەیە کە وەك ئەمانەتێك بە سەر شانیەوەیەتی .

ئەمەش دەبێت زۆر قوول و وردو فروان بێت.

أ ـ دۆزینەوەی نمونەیی ترین ڕێ بۆ نمایش کردن و پیشاندانی ئیسلامێکی ڕاست و دروست بەو خەڵکە .. لە لایەن عەقیدە و فیکر و بەرنامەی ژیان و هتد .... ئیسلامێکی بێ گەرد و پاکژ لە هەموو گەردو لەکەیەکی جاهیلی و بت پەرستی و سەلبی ، کە بە هوی دووری مسوڵمانان لە ئیسلامەوە ئاخنراونەتە ناو ئیسلامەوە یا بە هۆی هەندێك لەوانەی کە بە ناو زانان و ئەرکی حەقیقی سەرشانی خۆیان بە جی نەهێنا وە، لە گەیاندنی پەیامەکەی خوادا بەو شیوە ڕاستەی کە پێویستە .

ب ـ هێنانەدی وورپایی‌یەکی ئیسلامی ڕوشن ، لەناو تاك و کۆمەڵ و دەوڵەت دا هەتا هەموو یەکێك لەوانە هەست بە بوون و کیانی خۆی بکات و ، پارێزکاریش لەو بوون و کیانەی خۆی بکات .

ج ـ هەوڵ دان بۆ هێنانە دی یەك ڕای ئیسلامی بە گشتی ، تایبێتە قورسایی یەك و کاریگەری خۆی دابنێت لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتی دا ، بە تایبەتی لەو کارانەی کە پێوەندی‌یەکی زیندوو کاریگەر و ڕاستەوخۆیان هەیە بە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی یەوە ، وە بە تایبەتی تریش ئەو کێشانەی کە پەیوەندیان بە ئوممەتی ئیسلا می یەوە هەیە لە جیهانی ئەمڕودا .

ئەمانە کۆمەڵە بنەمایەك بوون بە گشتی بۆ دارشتن و دامەزراندنی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای ئیسلامی ..

لە هەمان کاتدا کۆمەڵە بنەمایەکی تایبەتی هەن بو دارشتن و دامەزراندنی هۆکارە جیاجیا و کەناڵە جۆرا و جۆرەکانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لەسەر بنەمای ئیسلامی کە بە کورتی لە هەر هۆکار و بوارێك دا ئەمانەن :

**هۆکاری ڕاگەیاندنی بینراو :** کە برێتی یە لە سینەما و شانۆ و تەلەفزیۆن ..

یەکەم : ـ

دەبێت بە هیچ شێوەیەك کەم تەرخەمی نەکرێت لە پێشان دان و نمایشکردن دا چ لە ڕووی ئەداء و چ لە ڕووی گفت وگۆ و حیوارەوە ، دەبێت دوور بکەوینەوە لە هەموو نزمی و سووکی یەك چ لە ئاخاوتن و ووشەدا یا خود لە واتا و نێوەروکی ووشەدا .

دووهەم : ـ

دەبێت هەموو توانایەکمان بۆ ئەوە سەرف بکەین ، کە زاراوە و مەفاهیم و موفولە ئیسلامی‌یە بەرزەکان ، لە شێوازێکی زیندوو واقیعی دا پیشان بدەین ، بە بێ قسەی سەوز و سور و بریقەدار ، بەڵکو ووشەی سادەو پڕ واتا کە بتوانێت هەست و هۆشی و ویژدانی ئەو خەڵکە بووروژێنێت .

**هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بیستراو :** ـ کە برێتی یە لە ڕادیۆ .

یەکەم : ـ

دەبێت دوورکەوینەوە لە دریژدادری .. وە تەرکیز بکەینە سەر ئەو بابەتانەی کە زیندوون و جیگەی ئیهتیمامی ئەو خەڵکەن لە هەمان کاتدا دووریش کەوینەوە لە زۆر کورت و کوێی کە وەك ئەلغاز و مەتەڵی لێ بێت ، بەڵکو بە شێوەیەکی سادە کیشەکان بخرێنە بەر تیشکی لێ کۆڵینەوە و چارەسەرکردن .

دووهەم : ـ

بەکارهێنانی ووشەی ئاسان و ڕەوان ، کە بە زوترین کات گوێگر بتوانێت وەری گرێت و کەڵکی لێ وەربگرێت .. جێگەی خۆی بکاتەوە و کاریگەری خۆی دابنێت لە گوێ و مێشکی بیستەر دا .

دووەم : -

ڕاگەیاندنی دەرەوەیی .. کە ئەمەشیان گشتی یە و بو هەموو جەماوەرەو ...

جەماوەریش دەبێت باش بناسرێت و وورد هەلسەنگێنرێت و پڕ بە پری خۆی بەرنامەریزی بۆ بکرێت و لەگەلێدا بدوێین .. تا هەموو ڕاستی یەك تێ دەگات و تا ڕابوون دەناسێ و تا پەردەی دەستکردی ژەهراویش لەسەر دلّ و چاوی زۆربەی زۆری ئەو خەلکە سادەو داماوە هەلدەمالرێت .

کەواتە ئەگەر چاوێك بخشێنین بەو واقیعەی ئەمرۆی خۆمان دا ، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئێمە ئەمرو لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیمان بە ڕاگەیاندن هەیە ، پێویستیمان بەوە هەیە دەزگاکانی ڕاکەیاندنی لەسەر بنەمای ئیسلامی دابمەزرێنین ، چ ڕاگەیاندنی ناوخۆیی بێت یا خوده دەرەوەیی ...

بۆ ئەمەش پێویستمان بەوە هەیە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن پێش هەموو شتێك لەسەر بنەمای ئیسلامی دابمەزرێنین ئیتر هۆکارەکە ئەگەر بینراو و نمایشی بێت وەك تەلەفزیون و سینەما و شانۆ ، یاخود هۆکاری بیستراو بێت کە بریتیە لە ڕادیو ، یا بیستراووبینراو بەیەکەوە کە وەك وتاربێژی و کۆڕ و مونازەراتی هەمە لایەنی بێت ، یا هۆکاری خوێنراوە ، کە بریتییە لە کتێب و نامیلکەو گۆڤار و ڕۆژنامە و بلاّوکراوە و هەرچی شتی دیکە ... کە هەر هەموو ئەم هۆکارانە دەبێت لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا لەسەر بنەمای ئیسلامی بەکاربهێنرێن و بکرێنە هۆکارێکی کاریگەر ، کە ئەم شتانە هەتا ئێستا زۆربەیان دژی مسولمانان بەکار هاتوون و بەزەرەر و زیانی ئێمە تەواو بووە ، بەلام کاتێك بتوانرێت ئەم هۆکارانە بە ئیسلامی و بۆ ئیسلام بەکار بهێنرێن ئەوا هاوسەنگەکە هەلدەگەرێتەوە و بە قازانجی مسولمانان و زەرەری دوژمنانیان تەواو دەبێت .

ئەوشتانەی کە پێویستە ڕەچاو بکرێت بۆ ئەم گۆرانکاری یانە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا و بنیات نانیان لەسەر بنەمای ئیسلامی ئەمانەن :

یەکەم :-

دلسۆزی و خۆماندووکردن و تواندنەوەی پیاوانی ئیعلامی ئیسلامی لە ناو بواری خۆیاندا .

دووەم :-

بەهێزکردنی پەیوەندی برایەتی و ئینسانی لە نێوان پیاوانی ڕاگەیاندنی ئیسلامی دا ، بە شێوەیەك هەر هەموو وەك یەك ئامێر کار بکەن بێ جیاجیای و بێ ئەوەی ووزەیان تەفرو تونابێت وەك ئاردی ناو درك .

سێهەم :-

کەلك وەرگرتن لە هەموو گەشەکردن و نەشو نوماکردنێکی ڕاگەیاندنی لە هەموو شێوازێکی دا ، بۆئەوەی بتوانرێت بەکار بهێنرێت بۆ خزمەت کردنی ڕاگەیاندنی ئیسلامی ، لە چوارچێوەی ئیسلام دا .

چوارەم :-

یەکخستنی مەبەست و مەرام ، بەمەش کارە کە بەهێز تر و بەرهەم دارتر و بەرەکەت تر دەبێت .

خالەکان زۆر سادەن و هەموو کەس تێیان دەگات بەلاّم با کەمێك خالّی چوارەم ڕوون بکەینەوە ، کاتێك دەلّێین یەکخستنی مەبەست و مەرام ، مەبەستمان لەوەیە هەموو کارەکانی ڕاگەیاندن و هەموو هەولّ و کۆششی و خۆماندووکردنێك بۆ ئەوە بێت ئامانج و مەبەست و مەرامەکانی ڕاگەیاندن بۆ هێنانەدی ئەم سێ خالّە بێت :

چونکه ووشەی قطلە و قەرە بالغ و پێچ پێچیدە دەبێتە بارێکی گران بەسەر گوێگرەوە .

**هۆکاری بینراووبیستراو لە یەك کاتدا :** کە بریتی یە لە ووتار بیژی و کۆڕ و مونازەرات .

یەکەم :-

وتار بیژی خۆی لە خۆیدا هونەرێکە کە بنەما و کولەکە و مەرجی تایبەتی خۆی هەیە وە ووتاربیژی سەرکەوتوو ئەوەیە بتوانێت دەسەلات بگرێت بەسەر گوێگرەکان دا بە ئاسانی ، خۆ ئەگەر ووتار بێژ یاخود کۆڕگێر یاخود مونازیر زانا و ڕوشنبیر و پسپۆڕ بوو ، ئەم سەرو ئەو سەری بابەتەکەی پشکنی بوو لێکۆڵینەوەیەکی هەمە لایەنی لە سەر کرد بوو ئەوا دەتوانێت گورانکاری یەکی دیار بە دەست بهێنێت لەو بوارەی خۆی دا .

دووهەم :-

ئەوەی پێویستە بزانرێت لەم کەنالەدا ئەوە یە کە ووتار بێژ و کۆڕگێر و مونازیر کارەکەیان زۆر سەخت و ئالۆزترە لەوکەسەی کە لە دوای بلندگوی ڕادیۆیەکەوە بەرنامە یان ئامادەکردووە و دەیخوێننەوە چونکە کۆمەڵە شتێکی لێرە زیاترە کە پێویستی بە کەرەسەو خۆ ئامادەکردنی تایبەتی هەیە .

**دوا هۆکار هۆکاری خوێنراوە :** کە بریتی یە لە ڕۆژنامەگەری و کتێب و نامیلکە و بلاوکراوە .

یەکەم :-

بەکارهێنانی واژەی بە هێز و پتەو و سەرنج ڕاکێش ، کە بتوانێت کار لە دڵ و عەقلی خوێنەر بکات بەر لە چاوی ، وە بتوانێت ووشەو واتاکەی بە شێوەیەك ببەستێتەوە بە یەکەوە کە خوێنەر تەسلیم بێت بەو واژە و واتا و دارشتنە ، نەك تەنها دارشتنیکی ڕووکەشی بێ ناوەڕوك بێت خۆ ئەگەر وا بوو ئەوا خوێنەر جەریدەی نووسراوەکە دەخوێنێتەوە بێ بایەخ و بێ تەرکیز کردن لەسەر بابەتەکە .

دووهەم :-

ڕەچاوکردنی هونەری چاپ کردن و هونەری ڕۆژنامەگەریی لەم چەرخی شارستانیەتی پیشکەوتووژیاری گەشەدارەدا ، کە زۆر گرنگە هاوکات لەگەڵ هونەری کتێب نووسین و ووتاری ڕۆژنامە ئامادەکردن دا .. کە دە بێت لەوپەڕی هونەری و زانستی دا بەرهەم پێشکەش بە خوێنەر بکرێت .

ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە ئێستا خەڵك تامەزرۆی کتێبێکن کە قەوارەکەی بچووك بێت و یەك کێشەی بە چڕ و پڕی خستبێتە بەر تیشکی لێ کۆڵینەوە و چارەسەر ، بە هەمان شیوە ئەو خەڵکە حەزیان لە ووتارێکی کورت و پڕ واتایە ئیتر ووتاری ناو ڕۆزنامە بێت یاخود گۆڤار یاخود هەر ووتارێکی تەنیا بۆ خوی ، چونکە کاتەکەی کاتی خێرایی یەو چەرخی خێراییەو ئینسانەکانیش ئاشنا و دۆستی ئەو خێرایی یەن .



# دیکتاتۆریەتی (من) گەرایی

دنیای بەشەریەت هەر وا بووە جارێك من جلەوی کاروان دەگرم و جارێك تۆ ، هەر یەکەشمان بە کوێرەی حەزی هەڵبژاردنی خـۆی هۆبەی نیشنەجێ بوون دیاری دەکات ، تۆیش ئازادی و منیـش هـەروا .... پێش منیش و تۆش جلەوی ئەم کاروانـە بێ کەس نەبووە. ئیتر تا ئیرە هاتووە و ئەم جارەش ـ ( من ) و ( تۆ ) ین کـە گوزەری پێ دەکەین . بەرەو مەبەست هەوڵ مەدە بە زۆر یان بە دیماگۆجی ئاسا بمکەی بە خۆت واتە ( من ) بکەی بە ( تـۆ ) ناچار ئەو کاتە لە کیانتا دەبم بە خۆرە .... خۆرە بو کیانی تـۆ بەلام پیرۆزم لە هزری خۆمدا .

تۆیش هەروەکو منیت بە پێچەوانەشەوە هەر راستە ، لیم مەبە بە تارمایی و وەك مێردەزمە بتەوێ سواری ملم ببیت ئاخر ئەگەر بتەوێ لەسەر ملی من هەنگاو بنێی نسکـۆ دەبەیت ... سەردەمیش شیوێکی سەر بەرە و خوارە پێدەچێ گلۆرت بکاتەوە بەرە و دامێن . دیارە تۆ هێندە بەرز دەروانی بۆیە لە بەردی لا ریش هەڵدەکەوی . تو تەنها نەفسـی ئەممارەت بالای بەرزە ئەگینا سنووری بیرکردنەوەت زۆر هاتووەتە یەك هەر جێکەی فیکری خۆتی تیا دەبێتەوە دەتەوێ هەنگاوی گەورە بنێی بەلام شوێن پێکانت بچووك دیارن !!

تۆ هەر دەتەوێ بدوێی تا مێشکی ( من ) ـەکان کـاس دەکـەی دوایش هەر دەدوێی کاتێکیش بێدەنگ بووی کـوێ ناکـری !؟ .

ئارام ئەحمەد جاف ئەیلولی ١٩٩٤

رۆمانی

# ڕاپەڕین

- بەشی یەکەم -

عومەر مراوودەلی

((١))

کە ڕەشەبا هەڵدەکا لقی درەختەکــــان دەخاتە جوڵە، جوڵەیەکی هێواش و دوایــی تا دەخاتە حاڵەتێک کە لقی هەندێک درەخت بەنایبەتی درەختی وەک بی، خۆیان لەبــەر ئەم ملمڵانێیەدا ڕاناگرن و دەبەزن، بــــە حەقوی ڕەشەباکە بەلادا دێن و خوێنیـــــان دەڕژێت، و تراژیدیای مەرگێک لەناو دڵــی دارستانـدا تۆمار دەکەن، هەندێ جار ڕەشەبا توڕەیەو جاری واش هەیە ئەوەندە توڕەنییە ڕەشەباش توڕەدەبێ و ڕقی هەڵدەستێ و ئارام دەبێتەوە .. ئەی چۆن؟ هەندێ جار ماوەیەک هەڵدەگاو دوایی کۆچ دەکات، جاری وا هەیە کە هێرش دەکاتە سەر ناوچەی شارێک هەروەک خوێنی بەری خاوانی گرتبێ ، واز ناهێنێ .. دەلورێنێ ، هاوار دەکا، درەخت و گاســی و تولە بای دەترسێنێ.. جا بۆیە هەر ئەوانــە باڵندە... هاوسەنگی فرینی باڵندەش بەرەشە با تێک دەشکێ .

بەلەمەکانی ناو دەریا لە کاتی ڕەشەبادا ڕوو بەڕووی چارەنووسێکی ترسناک دەبـــــن لە ناکاو .. لەکاتێکی ئەم جایەندا ڕەشەبــا بەلەمی ناو دەریا دەخاتە مەترسی و ئــەو کەسانەی کە لەناو بەلەمەکەدان چاوەڕوانــی مەرگێکی کوت و پڕ دەکەن.

نەک هەر لەناو دەریا بەڵکو لە وشکایش بەڵام مەترسی دەریا لەوشکایی زیاتــرە. وشکانیش مەترسی خۆی هەیە .. مەرگی دەریا لە مەرگی وشکایی جیایە .. مەرگی دەریـــا کوت و پڕە. بەڵام مەرگی وشکایی هەڵدێران.. خنکان،، سوتان.. بەڵام ئەنجام هەرمەرگە.



سـەرەتای هەموو زیندەوەرێک بە ژیـان دەست پێ دەکاو بە مەرگ کۆتایی دێ.

ئەنجام هەر مردنە بەڵام هەیە بەنارەوا ،،، دەکوژرێ، هەیە بەترسنۆکی کۆتایی بەتەمەنی دێ، کەسانی واش هەن بەرێزو بەشکـــۆوە پێشوازی مردن دەکەن . سەر بۆ زۆرداران دانانەوێنن. هەیە ژیانی لەکرداری نارەوا و خراپەدا بەسەر دەبا.. مردنەکەشی هەر بەو شێوەیە بە نارەوایی کۆتایی دێت.

دەستکەوتێکی مەزنە مرۆڤ بتوانـــێ لە ژیانی دا ئەرکی مرۆڤایەتی خۆی بەجــێ بێنێ ، و جی داوا لێ کرابێ.. جێ بەجێی بکاو لە دەرگای ژیانەوە بچێتە ئەودیوی .. دەرگاو کۆتایی بە ژیانی بێت .. چونکە مرۆڤ ئەرکێکی گرنگی لەسەر شانە، ئەرکی جێ نشینایەتی لەسەر زەوی، ئەرکەسی ئاوەدانکار بێنێ دەزانی ئەم ئەرکە چەند گرنگە .

هەندێ درەخت توانیان ڕەشەبانە ببەز ێنن. جا لەناو درەختیش دا ئازاو ترسنۆک هەن .. ئەی چۆن نیە ؟ لەناو درەخت و باڵندەو ئاژەڵیش دا ئازاو ترسنۆک هەیە دار بەڕووەکان توانیان بەرەنگاری ڕەشەباکە بکەن . ئاخر دار بەڕوو ڕەگ بەناخی خاکدا چوتە خوارێ ، بۆیە دەتوانی بەرەنگاری ڕەشە با بکات ، ئەوەی زوو لەبەردەم هێرشی ڕەشە باکەدا بەزی، داربی بوو.. لەگەڵ یەکەم هێرش و هەڕەشەی ڕەشەباکەدا لقەکانی شکاندەوە. کە ڕەشەباکە توند تر هەڵی کرد بارودۆخی هێمنی شار زیاتر باری ناسایی تێک چوو تۆزو خۆڵ و کاغەزو بەرگ کۆن و هەمــوو ئەو شتانەی کە کێشیان سوک بوولە کـــەلای ڕەشەباکەدا بەرز بوونەوە . لەهەندێک شوێن

ڕەشەباکە خۆڵی سەر شەقامەکانی لەگەڵ خۆ بردو شەقامەکەی پاک کردەوە... بەڵام لە شوێنێکی دیکە خۆڵەکەی خستەوە خوار کاتێ کە بەناو دارستانەکاندا دەهات.. ترس وهەرەشەی بەگوێی درەختەکانی دارستاندادەچاند کڕەو هاوارو هەڕەشەی بەردەوامی زیاترتری دەخستە دڵی درەختەکانەوە .

نەک هەر درەختەکان بەڵکو خەڵکی شار بەگشتی بێزاری خۆیان دەربڕی.. شاعیر و نوسەران لە بەرهەماکانیاندا باسی ڕەشەباکەیان دەکرد، کەل و پەلی ئەو دوکاندارانە کە لەسەر شۆستەکان بوون ، بەهێرشی ڕەشەباکە لە شوێنی خۆیان نەمانو بەم لا و بەولادا بڵاو بوونەوە . ماوەیەک بێدەنگی باڵی بەسەر شاردا کێشا ، دەشێ ڕەشەباکە بۆ شوێنێکی دیکە چووبێ.

پرچی ئاڵۆزی درەختەکان ئاسایی بوونەوە .. کانیاوەکانیش دەستیان بەدەم و چاویاندا هێناو ئاهێکیان هاتەوە بەر.

درەختەکانیش دەستیان بەپرچیاندا هێناو هەوری ترسیان ڕەوی یەوە ، خەڵکی شاریش ئەوانەی ڕەشەباکە قژی ئاڵۆزکردبوو دەستیان بە قژیاندا هێنا .

لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا ڕەشەبا هەڵدەکا . هەر وەرزەو خاسییەتی خۆی هەیە کە لە زستاندا هەڵ دەکا.. بەفری سەرلوتکە و دۆڵەکانی لە شوێنێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی دیکە.. سەرما لەگەڵ خۆی دێنێ و ڕومەتی درەخت و کانی و خەڵکی شارولادێ.. سوور دەکاتەوە.. هەروەک ڕقی لە درەخت و کانی و خەڵک بێ ... یان بیەوێ تۆڵەی خۆی بکاتەوە .. ڕەشەباش ئاوات و ئامانجی خۆی هەیە،چەندین جۆر با هەیە، ڕەشەبا.. شنەبا .. شنەی زەوی و شنەی دەریا.. وەیشومەو زریان . هەر بایەو خاسیەتی خۆی هەیە شنەی نەسیم کە لەبەهاران دا هەڵدەکا. دەست بەڕووخساری گوڵ و گیادا دێنێ و بۆنی گوڵان دەگەیەنێتە ناو شارو لادێ کان.

وەرزی هاوینیش کە شنەبا هەڵ دەکا. ئارەقی سەرو ڕووی جوتیارو کرێکارورێبوارا؟ دەسڕێ و جەستەیان فێنک دەکاتەوە .

با تۆوی گوڵان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگوازێتەوە ، لە ئەنجامی ئەم گواستنەوەیە درەخت و گوڵ دەپیتێن.. دەشێ با گەلی ئەرکی دیکەشی هەبێت.ئەمەیا ئەو کەسانە دەیزانن کە تایبەتمەندن لەبارەی باو جۆرەکانی باوە، هەندێ جار کەڕەشەبا هەڵدەکا لە بناری چیاکانەوە دەست پێ دەکاو لەوێوە دێ بەسەر گوندو شارەکاندا.

گەڵای درەختەکان دەکەونە بەر چەقۆی.. خەزان و دەکەونە ناو جۆگەلەو ڕووبار ی...... کانیاوەکان.. بەلاشەی گەڵای جوانە مەرگ دادەپۆشرێت.. هەندێ جار ڕەشەبا شێوەکە ی دەگۆڕی و دەبێتە بەگێژە لوکە .. ئەمەحاڵەتێکی توند ترو تورەتری ڕەشەبایە .

خەڵکی دێکان ئاشنای ڕەشەباو چونێتی هەڵکردنی ڕەشەباو کاری ڕەشەبا بۆسەرکشت و کاڵن.. نەک هەر ڕەشەبا.. خەڵکی گوند بەشێوەیەکی گشتی شارەزاو ئاشناو هاورێ ی سروشتن. دیاردەکانی ڕەشەبا .. باران..... زریان،، بەفرو شلۆقە.. نەخۆشی یەکانی دارو درەخت، خەڵکی گوند لەرێگای تاقیکردنەوەو ئەزموونی ژیانەوە شارەزای هەموو ئەمانەن

ماوەیەک ڕەشەباکە بێ دەنگ بوو، دوای دەستی بە هێرش و پەلامار دان کردەوە.

لە پەنجەرەی ماڵەکانەوە لە دەرگای ماڵەکانەوە بەبێ ئەوەی ڕوخسەت بخوازێو لە دەرگا بدات خۆی دەکرد بە ژوورەکاندا.

دروشمەکانی ناو بازارو سەرشەقامەکان کەوتنە بەر هێرشی ڕەشەباکەو بەملاو بەولادا کەوتنە جوڵە..

ئەو ڕۆژانەی کە خەڵکی شار خۆی بۆ بۆنەو بیرەوەری یەکی مێژوویی ئامادە دەکرد شەقام و کۆڵانەکان بە دروشمی ڕەنگاو ڕەنگ دەرازانەوە . هەر حیزب و ڕێکخراوە دروشمی خۆی هەڵدەواسی چەند شوێنێک لە شار دا بۆ دروشم هەڵواسین تەرخان کرابوون. هەر کەسێک دەستپێشکەری بکردبایە ئەوا زوو دروشمی خۆی هەڵدەواسی دەنا شوێنەکە ی دەگیرا ... ئەوکاتە ناچار دەبوو دروشمەکەی بەرێتە شوێنێکی دیکەو هەڵی واسێ .

- کاکە روخسەت هەیە منیش ئەم دروشمـــە هەڵواســم . ؟
- دروشمی چ حیزبێکــە ؟
- ئەگەر هەڵم واسـی دەزانـی .
- فەرموو شوێن ماوە هەڵی واســە .

خەڵکەکەش بەتایبەتی خەڵکی بێ کــار ماوەیەک کاتی بەخوێندنەوەی دروشم و بڵاو کراوەکانـی سەر ئەو دیوارانە بەسەر دەبرد...

ماڵی مامۆستا ئازاد کەوتبووە ســـەر شەقامی گشتی شار .

ماوەیەک بوو گواستبوویانەوەبۆ ئـــەو گەرەکە. لە پێشدا خانووەکەیان لە نزیک ئەو قوتابخانەیەوە بوو.. کە ماموستا چەند ساڵێک بوو لەوێ ماموستابوو.. خانووەکەیان لە سێ هۆدە پێک هاتبوو .. بەڵام بەختیاری کـورە گەورەی ماموستا حەزی دەکرد هۆدەیەک بـە تەنیشت هۆدەکەی پێشە وە دروست بکات .

ڕۆژێک باسی ئەوەی لەلای باوکی کــرد پێشتریش لەلای دایکی باسی کردبوو..ویستی بیرو ڕای باوکی لەو بارەیەوە بزانێ.
- کوری خۆم هۆدە زۆری تێ دەچێ ، جارێ.... ئەوەندەمان بەسە..

خانزاد خانی خێزانی ماموستا بەرێزێکەوە... ڕووی کردە مامۆستاو گوتی:-
- کوڕەکە حەز دەکا هۆدەی خۆی هەبێ با بیکا ماموستا ئازادیش نەیویست بێ دڵی بەختیار بکات.. کاتێ زانی بەختیار بۆخوی ئەوەند ە پارەی هەیە هۆدەی پێ بکات .

بەقسەکانی بەختیارو خانزاد خانـــی خێزانی قایل بووکوتی :-
- جا ئەگەر پارەی هەیە من پێم چاکــە.

خانزاد خانیش ویستی بە قسەی خۆش ماموستا و بەختیار خۆشحال بکات بۆیە بەزەردەخەنە یەکەوە کوتی : -
- بەڵکو کورەکە بیەوێ ژنێ بێنێ، بۆیە هودەی دروست دەکات .. بەختیار بەم قســەی دایکی ڕەنگی سوور هەڵگەرا .. ویستی ئـەو قسەیە لەبیر دایکی بەرێتەوە بۆیە بەشدرێیە وە کوتی :-
- نا... میوانمان زۆردێ و دەمانەوێ..

دایێنیش ویستی شەرمی بشکێنێ ، بەزەردە.. خەنەیەکەوە کوتی :-
- جا ئەگەر ژن دێنی گوارەکانی بۆ دەفرۆشم.

کاتی دایکی ئەو قسەیەی کرد زەردەخەنە یەکی تێکەڵ لەشەرم کەوتە سەر لێوە - کانی بەختیار.. لەوکاتەدا نیگایەکی سۆزنا کی ئاراستەی دایکی کرد ، سۆزو وەفـــای بەرامبەر بەدایکی لەو نیگایەدا دەرخســـت

مامۆستاش هەروەک بیەوێ ئەوەندەی.. دیکە بەختیار نەخاتە حالەتی شەرم و تەریق بوونەوە .. قومێکی لە چایەکەی داو گوتی :-
- ئافرەت چایەکی دیکەم بۆ تێکە بەڕاستـی چایەکی چاکەو بونێکی خۆشی لێ دێ .
- جا چای من هەموو جاری وانەبووە ؟!

مامۆستا بەزەردەخەنەیەکەوە کوتی : -
- هەموو جاریش نـا .

دوای دوو روژ پرۆژەی هۆدەکەی بەختیار قسەی لێ کرایەوەو بریاریان دا بەختیار لەو پارەیەی کە بە ئاڵ و وێر دەستی کەوتبـــوو ئامادەی بکاو ناوی خودای لێ بینێ و هۆدەکە دروست بکـا .

هەر ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ - یان کرد بەختیار نەیکردە تەمبەڵی و ئیشی ئەو ڕۆژەی نەخستە سبەینێ و چوو بــۆ ماڵی وەستایەکی ئاشنای لەو بارەوە قسەی لەگەڵ کردو لەگەڵی ڕێک کەوت.. وەستاکە ئەو کەل و پەل و شمەکانەی پێویست بوون لــە پارچە کاغەزێک نوسینی و داینە دەســـە بەختیـار تاوەکو بیان کڕێ و دەست بەکار بکەن .. بەختیار لەیەکەم ڕۆژەوە وەک کرێکار - یێ ئیشی کرد .. مامۆستا ئازادی باوکیش جارجارە یارمەتی دەدان و حەزی دەکرد کـە بەختیاری کوڕی ئیش بکات ..

چونکە هیچ کاتێک نەیدەویست منداڵە - کانی وا پەروەردە بکا.. کە نەتوانن بەسەر کەندو کۆسپەو هەورازو لێژی ژیاندا سەرکەون

بەڵکو دەیویست قاڵ بووی هەورازو لێژ و ماندوو بوون و کەشەنگی و ڕۆژکاری سەختی ژیان بن.. ئەمەشی بەهۆیەک دەزانی بۆ ئەوەی لە رووی جەستەیی و دەروونی یەوە زیاتـــر پەروەردەبەکی ڕاست و دروست وەربگرن .



ڕەشەباکە ماوەیەک پشووی‌دا .. لقی‌درەختەکان هاتنەوە دۆخی جارانیان .. خەڵکی شار بە تایبەتی ئەو گەنجانەی کە قژیان زۆر بوو. دەستیان بە قژیاندا هێنا. لاشەی هەزاران. گەڵای جوانە مەرگیش لەسەر ڕووی کانیاو و جۆگەکان دەبینرا.. ریزە دار بی‌یەکەی مالی مامۆستا ئازادیش کە ڕەشەباکە هەڵی دەکرد پرچەکانی ئاڵۆز دەبوون و کە کۆتایی دەهات دەستی بە سەر پرچەکانی دا دێناو ئاسایی دەبووە ..

لە نزیک دار بی‌یەکە .. هەنارێکی کورتە باڵا هەبوو.. کە هێلانە چۆلەکەیەک لەسەر لقێکیەوە بوو .. چۆلەکەکە لە وەرزی زاووزێ و هێلانە دروست کردن دا دەهات‌لەسەر ئەو لقە دەنیشتەوەوماوەیەک باڵەکانی لێک دەدا و چاوێکی بە هەوارکەو نیشتمانە بچکۆلەکە ـیدا دەخشاند.. بەدەندوک پوشو گیاوپەری لە هێلانەکەی کۆ دەکردەوەو نوێی دەکردەو

ڕۆژانە دەهاتە سەر لقی دار هەنارەکە و ماوەیەک گۆرانی دەجری. لەوێوە دەفری‌بۆ سەر دار بیەکە لەوێوە بە ئاسمانی شاردا باڵەکانی لێک دەداو دوایی دەهاتەوە نـا و هێلانەکەی ماوەیەک لە زێدو نیشتمانە بچکولەیەدا ئارامی دەگرت .

چەند جارێک دەیجریواندو سروودی سەربەستی و ئازادی دەجری زۆرجار مامۆستا ئازاد لە ژێر سیبەری دار بی یەکە دادەنیشت و کتێبێکی بەدەستەوە دەگر ت یان دەستی دەکرد بە نوسین .. گوێی بۆ جریوەی چولەکەکە ڕادەگرت.. جاری واهەبو پۆل پۆل مەل باوەشیان بە حەوشەکەی ماڵی مامۆستادا دەکردو بەیەک دەنگ دەیانجریواند و گورانییان دەجری .. ئەو چولەکە ئێسک سووکە لەکاتی هێلکە کردن دا دەهاتە ناو هێلانەکەو هێلکەی دەکردنکە لە هێلکە کردن دەبووەوە .. پاش چەند ڕۆژێک هێلکەکانی هەڵ دەهێنان ..چەند زەرنەقوتەیە چاویان بۆ ژیان دەکردەوە .. هەموو جارێ چولەکەکە هێلانەکەی بەجێ دەهێشت.. و بەدەندوک خواردنی بو زەرنەقوتەکان دەهێنا هدرکە دەگەیشتە لایان زاریان قوش دەکرد



### تەنزی کۆمەڵایەتی :

# سەردانی سیاسەتمەدار

عمر یوسفی

عادەتی وابوو ، خواخوای بوو یەکێك بڵێ سەلکی سیر ، تا ئەو بڵێ قنچکی پیواز . ئێ خۆ هەر کەسەو خوویەکیشی هەیە ، هەموو کەس یەك شێوە نین ... دەنا دەبوو لە ناو ئەو هەموو جرِوجانەوەرەدا کێویی ببین ........ ماوەکی زۆر بوو نەم دیبوو ، مالم حەقە ، حەقیش دەلێم ، بە دیتنی دا چڵەکیم ! ئاخر ئەو جۆرە بەنی ئادەمی یانە هەر ئەوەندەی وەکو چەسپی " دووقولوو " پێتەوە نووسان ، لێ بوونەوەیان نی یە ! ... چاك خۆم ئامادە کرد کە سەری خۆمی پێوە نەهێشینم لە بەرامبەر هەر پرسیارێکی دا بلێم : (( ئم ... نەخیر ... زۆر راستە ، بەلێ )) بەلام هەیهوو هەیهوو ، کوندە لە کوێ کەوتووە و دۆشاو لە کوێ رژاوە . لیم نزیك کەوت و گوتی : -

(( ئێ ... ئێ ئەوەی ئەوە توی ، لە ئاسمانان بە دوات دەگەرام لەسەر ئاوی قولێ وەگیرم کەوتی ! پێت وا نەبێ وا بە سێنایی لیم دەرباز دەبیت ، یا دەم گۆزی یا دەبێ ئەمشەو میوان بی ، ئاخر حەشرەتەکەم هاوری ی سەردەمی سەرەتایی زۆر خۆشەویستە : من نالێ ی موخلیسە فەندی هەر " ئەحمەد " ەکەی جارانم ، بەوەی نیە ئێستا پێم دەلێن ماموستا ئەحمەد )) .

دەمزانی وەکو سمورەیەکی بێ بەزن و بالا بە تەلەی جەنابی ماموستا وە بووم و ، نەجات بوونم بۆ نی یە . بەلام لە گەردنم بدات ئێستا ئەو مەجالەم نی یە میوانی بم بویە گوتم :

(( عەزیزەکەم ، نووری هەردووك چاوم تەکلیفێکم هەیە بیکرەوە ! ))

گوتی : (( وەی وەبان هەردوو دی یەم )) .

گوتم : (( دیم بەلام رۆژی گونجاو تر لەم کاتە .... ))

گوتی : ئاخ ئەو خەلکە چۆن لە زەوق و سەلیقەی من دەدەن ، بە هەر حال ئەوە لێت گەرام ، بەلام پیاوی ماقوول ، ئەتۆ ئەدریسی من چوزانی ؟

گوتم : (( دەست نی یە لە گوزەی مابێ ، ئێستا نیوونیشانم بۆ هەلبدە خۆم دەیدوزمەوە . ))

گوتی : چاکە هەر کەهاتینە ناو ئوردوگا ، دەگەیتە مزگەوتێك لەوێ لە هەر کەسێك پرسیار بکەیت ، مالێ مام پیروت لە کوێ یە دەلێ ئەوەتا ...

بەلێ ماموستا ئەحمەد رۆیشت بەلام وەکو ئوتومۆبیلی خراپ دوکەل و پەزارەیەکی زوری لە دواوە بۆ من بە جێ هێشت .

وەك دەلێن ز لە بەلێن دا لێپرسراوێتی هەیە )) ناچارم سەری لێ بدەم ئەو هەتیوەش دەلێ ی چیکەنە یە پۆ قسەکردن ، راست بە پێچەوانەی منەوە . لێم گەرین بە هەفتە مینگەم لێوە نایەت ... بەلام ئەوە رەمەزانە و زۆریش وەرزم . بیرم کردەوە ، جا بۆ نەچم و بەلێنەکەم نەبەرمەسەر ، هەرچەندە کۆنیش بووە .

لە تەنیشت مزگەوتەکە لە ژنێك پرسیارم کرد ، کە وەك داوەلێ سەر بیستان لە نێوان دوو دەرییەکی گەورەدا وەستا بوو گوتی :

(( هەر کە لێرەوە رویشتی و پێچت کردەوە دەگەیتە خانوو بەرەیەکی خۆش کە باخچەیەکی تێدا یە ، ئەوە مالی جەنابی ماموستا ئەحمەدە . ))

دۆزیمەوە . بەر دەرگاکەیان پر لە ژن وزال و مندال بوو . سلاوم کرد و پرسیم :

(( ئەری بی زەحمەت مالی ماموستا ئەحمەد ئێرەیە ؟

پیاوێکی کاملی توزێك وەنێو کەوتوو هاتە پێشەوە و گوتی :

(( فەرموو ، راست خۆیەتی ))

گوتم : (( بۆ خۆی لە مالەوە یە ؟ توزێك کارم پێ یەتی . ))

گوتی : (( جا ئەگەر بۆ خۆی لە مال نی یە ، خۆ مالەکەی لەگەل خۆی نەبردووە . ))

چوومە ژوورەوە دانیشتم ، سەرینێکی گەورەیان وەپال پشتم دا ، باوکی ماموستا لە تەنیشتمەوە دانیشت ، دایکیشی بەرامبەرم . توزێك بێدەنگی هەموومانی داگرت ، لە دەرگاکەوە سەرنجم دا ، کیژە عازەبەکەیان زۆر بە پەلە دەهات و دەچوو ، دەتکوت مەکوی جۆلایە ، قاپ و قاچاخی دەهێنا و دەبرد ، لە شێوەی هاتوچووی دا شتێکی سەیرم بەدی دەکرد ، دەبێ خوایە ئەو کچەتیوە بۆ ماخولیانی پێ کەوتبیت ؟ !.

باوکی ماموستا ئەحمەد کۆخەیەکی بۆکرد و گوتی :

(( هەرچەندە وەختەکەشی زۆر چاك نی یە ، خزمەتێکمان بۆ ناکرێ ، بەلام تاکو ئەحمەدی کورم دێتەوە دەتوانیت بۆ خەوت بخەویت و ئیسراحەت بکەیت .

دایکی ماموستا ئەحمەدیش گوتی :

(( بریا وەختەکەی رەمەزان نەبایە ، تاکو خواردنێکی چاکمان ساز بکردایە ، هەرنەبا شەربەتێکی بە تامان دروست دەکرد ، چایەکی خالیمان لێ دەنا .. ئاخر وەك گوتراوە :

(( میوان خۆشەویستی خوایە )) .

گوتم : (( من لەگەل ماموستا ئەحمەد دا زۆر دۆستم ، کە هاتووشم بۆ لای ، بۆ خواردن نەهاتووم . دەنا خواردن لە گەرەکی خۆشمان هەبوو !! )) .

وردە وردە پرسیاری سەیر و سەمەرە دەستی پێ کرد :-

باوکی ماموستا ئەحمەد گوتی :

(( لە مێژە ئەحمەدی کورم دەناسیت ؟!)).

گوتم : (( ماوەکی زۆرە پێکەوە ئاشناین ....)).

دایکی هە لێ دایەو گوتی :

(( جەنابت بە بنەمالە لە چ عەشیرەتێکی ؟!

گوتم : (( من بە بنە مالە مەلا زادەم ، لە دایکەوە دەچمەوە سەر مەلا ئیسا و مەلا نەبیان لە هەلۆنێ : لە باوکیشمەوە سەر بە بنەمالەی " مەلا یوسف و مەلا سمایلان " م لە دەوروبەری دارەشمانە )) .

باوکی گوتی : (( دایك و باوکت ماون ؟ ! ))

گوتم : (( باوکم بەر رەحمەتی خوا کەوتووە و دایکیشم زرو زیندووە )) .

دایکی ماموستا ئەحمەد گوتی :

(( ئیستا مالتان لە کوێ یە ؟ ! ))

گوتم (( مالمان لە پانایی پشدەرێ یە ))

تا دەهات پرسیارەکان چڕتر دەبوون و هێندێك جاریش لە سەرو سیمای یەکێك لەو دووانەدا ، قەرتالێك کلکە پرسیار و نیشانەی سەرسوڕمانم بەدی دەکرد ، هاتو چۆی بێهوودەی چەتیوە بابان ویرانەکەشیان لەم هودە بۆ ئەو هودە هێندەی تر گومانی بۆ دروست دەکردم . خۆم وا دەهاتە بەرچاو کە لە مەحکەمەم و تە حقیقم لێ دەکرێ .

باوکی مامۆستا ئەحمەد فەرمووی :

(( خوشکەکانت ماون ، چەند برات هەن ؟ !))

هات و هاوارای مندالانی کۆلان هۆشی لای پرسیارەکەی بریم ، گوێم لێ بوو دەیانگوت :

(( عەلەشیش گاران هات ! )) عەلەشیشەکانیش بەیەك دەنك دەیان گوت : (( قوولوو لوولوو))

ئا لەم کاتەدا دەنگی هێلیکوپتەرێك نزیك بۆوە . مندالە لاسارەکان وازیان لە قەلەموونەکان هێنا و بە یەك دەنگ هاواریان کرد : (( عە لی کوپتەر واوەرە چیشتەکەمان ساوەرە ! )) .

کەوتمە نێو خەیالان ، هەیاران عەلەشیش بۆچی بە هاتنی کاران کیچ دەکەوێتە کەولێ یەوە و هاواری لێ هەلدەستێ ؟ یان بۆچی مندالان زیاد لە هەموو خواردنێك ساوەریان بۆ جەنابی هێلیکوپتەر سازکردوە .

وە هۆش خوم هاتمەوە سەرنجم دا باوکی مامۆستا ئەحمەد چاوی بزکردۆتەوە و تیم دەڕوانی ، ... گوتی خوشکەکانت ماون و چەند برات هەن ؟ !

گوتم : (( سێ چوار براین و خوشەکەکانیشم سەلامەتن )) .

گوتی : (( مەبەستم ئەوە نی یە ، دڵیێم چەندیان مێردیان کردووە و چەندیان ماون )).

گوتم : (( دوویان مێردیان کردووە و دووشیان ماون )) .

دایکی ئەحمەد هەلێ دایە و گوتی :

(( لە مەکتەب لەگەل ئەحمەدی کورم پێکەوە دەخوێنن ؟ ! .

ئەم پرسیارە ناخی داخ کردم ، یەکسەر زانیم ئەو مالەی من بۆی چووم هەو نی یە و بە هەلە هاتوومەتە ئێرە )) .

لەبەر خۆمەوە گوتم : بە خوا چاك تێوە گلاوم ، جا ئێستا مامۆستا ئەحمەد بێتەوە دەبێ وەزعم چی لێ بێت ، وەلامم دایەوە و گوتم : (( نەخێر هەر لە دەرەوە یەکتر دەناسین )) .

ئیدی کەوتمە سەر ئەوەی کە خۆم دەرباز بکەم ، پێم گوتن :-

(( درەنگ بووە و ئەویش هەر نەهاتەوە دەچم بۆ مزگەوت کە هاتەوە با لەوێ سەرم بدات )) . لە ڕێگای مزگەوت چاوم بە مامۆستا ئەحمەد کەوت ، چوینە مالەوەیان ماوەیەکی باش دانیشتم ، لە کاتی ڕۆیشتن دا پێم گوت : (( دەزانی تووشی بەلایەکی سەیرت کردم ! )) .

گوتی : (( چۆن ؟ ! ))

گوتم : (( بەو ناونیشانەی کە دا بووتمێ لە بەشی خوارەوەی ئوردووگاوە هاتم و پرسیاری مالێ ئێوەم کرد ، کەچی مالێ مامۆستا ئەحمەد یێکی تریان نیشان دام ، پرسیاریشیان زۆر کرد ... منیش ئاوا وەلامم دانەوە ... )) .

گوتی : (( کورە وات نەکردبێ ؟ ! ))

گوتم : (( بۆچی هەیە ؟ ! ))

گوتی : ئەو مامۆستا ئەحمەدە ، بە تەمای ژن بەژنەیە لەگەل برادەرێکی دا . خوشکەکەی ئەوی دیتووە و ئەوە سێ ڕۆژە چاوەڕوانی ئەو برادەرەن بێت و کچەکەی ئەمان ببینێ ! وەلامەکانی تۆش دەق ڕاستن .

گوتم : (( دەچیت دیووە هەمووی بۆ بگێڕەوە ))
ئیستا ئەو تەلیسمەم بۆ شکا ، خوا حافیزیم کردوو گەرامەوە .

ئەمرو پینج سالی تەواو بەسەر سەردانی ئەو دۆستەدا رەت دەبێت ، لە مەیدانی شێخ ئالای هەولێر چاوی بە من کەوتەوە و گوتی :

(( ئێ.. ئێ، ئەوە توی .. لە ئاسمان لیت دەگەڕام لە مەیدانی شێخ ئاللای هەولێری وەچنگم کەوتی ، دەرباز نابی ، یا دەم کوژی یا دەبێ ئەمشەو میوان بین . ئاخر ، حەشرەتەکەم ، هاوڕێ ی سەردەمی مندالی زور خوشەویستە . من هەر ئەو بەندەی دلسوز ماموستا ئەحمەدەم کە هەم ، خوت دەزانی لەگەل ئەشراف زادەیەکیش ئیزدیواجم کردووە . ((دورمەی )) لای کویە ناوبانگی هەیە ، یان لادی یی وەك تو تامی نەکردووە و نازانی دنیا چ باسە ، لە قاموس و هەمبانە بورینەدا بوی مەگەری نایدوزیتەوە لە مالی من بوتی ساز دەکەین ئەوجا هەر خواردنیش نی یە ، پیروزبایم لێ بکە و بزانە لایەقی کوڕە قوزیکی وەکو منی هەیە یان نا ؟!)).

گوتم : (( بە شەرتێ دێم ، هەوەلێن بەژنی باریك بەساز کردنی یاپراخەوە ماندوو نەکەیت ، سانیەن وەکو جارە کەی دیکەم لێ نەیەت تووشی مالی مام پیروت ببم کە " خەریکی ژن بەژنە بوون " سالیسەن توزیك بێ تاقەتم ، کەمتر سەرم بکەیتە سەر و باسی عەرش و قورشم بو نەکەیت .

گوتی : (( وەعدەت پێ دەدەم بێ دلیت نەکەم و چونت مەیل گرتی وا بکەم ، بەلام بو مەسەلەی " دورمە " هەر خوم مەیلم لێ یەتی ئەگەر پیشت خوشە کەللە و کیپەت بو ساز دەکەین و سیریشمان وەکو خول هەیە .

کە باسی کەللە و کیپەو سیری کرد موچورکم پێ داهات و گوتم :

(( بە قوربانت دەبم ، با هەر " دورمە " بێت سیریشی نابێ تێبکەن چونکە سیر بمخوات نای خوم ! )) .

گوتی : (( ئەی ... کوڕە ، خو هەر کورەکەی نیو قەڕن لەمەوبەرە )) .

دەزانی دکتور و موکتور دەلین حەفتاو دوو دەردان دەبات ، دەنا من هەموو ڕوژیك دوو جاری دەخوم ، ئێ ... تو چوزانی سیر چییە ؟ هەی لاولاو ، هەر هیچ نەبێت موولوولەو خوین هینەر و خوین بەرەکان پاك دەکاتەوە .

گوتم : (( لوولە خوینەکانی من ئاو ئاوە رو نین هەموو ڕوژێ جومالیان بوویت )) .

گوتی : (( باشە حەیاتەکەم ، ئەوە لە کات ژمیری سفرەوە تا سەفەرەکەی توتەواو دەبێت سیر خواردن لە مالی ئیمەدا ـ ئەکیدەن ممنوع ئەست ـ )) .

بو ئیوارە سواری پاسی دارەتوو بوم ، یەکراست بو مالی کاك ئەحمەد گفت و شنود هەر لەسەر " دورمە " وە بەردەوام بوو ، قسەکانی ئەو برادەرەم بە تەواوی گوڕابوون جاران باس و خواسی هەر لە دەوری ژن و ژن خوازی دا دەوریان دەدا ، بەلام ئیستا دوای ئەوەی بە مراد گەیشتووە و بوخچەی کراوەتەوە ، دەم لە سیاسەت وەردەدات . لە ئیوارەوە دەستی پێ کرد ـ هەرچی دەیگوت نەیدەگوتەوە . هێندی دیکە ئیستوپی چەنەکەی بەرببوو . وەکو بریشکە قسەی دەتەقاند ـ دژی عەرز و عاسمان قسەی دەکرد و پلاری دەگرتە سیاسەت مەدارانی ولاتەکەم ، سەر بە هیچ لایەنیکیش نەبوو .

لە دلی خوم دا گوتم :ـ

(( بریا " دورمە " م بە قوزەلقورت

نەکردبایە و تووشی ئەم دەردەسەریە نەبووبام . قسەکانی ... هەموو قسەی کوڵانان بوو .. دەیجوی یەوە ، ژنەکەشی لە پەنایەوە لە دیوودرنج نەبێ لەچ نەدەچوو - بە سەر بادان و پان کردنەوەی دەمە بە سورا و سواغ دراوەکانی تەئیدی دەکرد .

لە پەنا سیاسەتەوە ئەوەی بە منی کرد با بە دەواری شەری نەکردووە ، ئێ خۆ سیاسەت مەداریش ئەو بوغز و غەرەزەی شەوان لەسەر جێگای کوێ دەکاتەوە بە بابایەکی وەکو منی نەرێزێ دەتەقێ .. رقم لە سیاسەت هەستا بوو ، دەم گوت : نەفرین لەو کەسەی بە ولاتی ئێمەی داهێنا ، کوشتن و برین سیاسەتە دەمەوەری پرۆفیسۆری یە ، جنێو دان زەمین بە زەمینە .

زانیم چی دی دەری ناهێنێ گوتم : با وەك عەدنان قەیسی زەربە عەکسی یەکی لێ دەم زەمین گیری بکەم خۆ شەر و نیوە شەر هەر یەکە ، لە سیاسەتیش دا بە شاگردی کەس نەدەشیا ... قەتیش فیشەکێکی نە تەقاندبوو وەختی خۆشی لەسەر ئەم زمان درێژی یە مەحبوبەیەکی لە کیس خۆی دابوو شارێکی دێنا . بۆیە پێم گوت :

(( کاکی برای ، من بۆ ئەوە نەهاتووم ئەم باسە بکەین ، هاتووم تۆزێك لەباس و خواسی سیاسەت دوورکەومەوە و باسی رۆژانی خۆشی رابووردومان بکەین " یادی بە خێر " رۆژانی رەبەنی و قوتابخانە ، ئاخر وەبیرت دێت کە جەنابت چەند پەلە پرووزەت بوو : بۆ هێنانی ست گولیزار ، ئێستاش زەرەرت نەکردووە لە خوا بە زیاد بێت خێزانیشت ئەوە دانیشتووە نەشلیم لە رووە ئافرەتێکی رێك و پێکە ( بەلام رازێکت بۆ دەدرکێنم :

چاوەکانی زلتر ببوون لە جاران ، گوتم : لەسەر ئەو زمان درێژی یەی خۆت گولیزارت دۆراند ، ئاخر ئەو پی ی گوتم : دەزانی بۆ مێردی پێ ناکەم ؟ چونکە زۆر قسە دەکات و زۆریش بە پەلە و سەریعە ، مەجالی کەس نادات قسەیەك بکات ؟؟ .

وەك ئەوەی ماکینەی کارەبا بکوژێتەوە - کێچەکەی بەرە و دوا گەرایەوە تا گەیشتە سەر سفر - لەو کاتەدا تەماشایەکی بەژنەی باریکیشم کرد چاوی بە مۆلەق وەستابوو ، وەك ئەوەی سیحرێکم بەتاڵ کردبێتەوە و باریکی گرانم لەسەر شان لادابێ هەناسەیەکی هەڵکێشا ، دنیا کش و مات بوو ، دەنگی تەلەفزیۆنەکە کە تاکو ئێستا لەبەر دەنگە دەنگی جەنابی سیاسەت مەدار نەدەبیسترا بەرز بووەوە کە دەیگوت :

لەم کاتە بە دواوە بریار درا شەری خۆ کوژی کۆتایی پێ بێت و هێرش و جەنگی تەبلیغاتیش بووەستێنرێت )) .

عومەر یوسفی
( ١ / ٨ / ١٩٩٤ )
بەر بەرۆچکەی پەرلەمان



# شێوازی بانگەواز و دواندنی خەڵکی

نووسینی فتحی یکن

وەرگێڕانی کاوە

٥

٥

هەروەها خوشک و برای موسڵمان دەبێت بەتەواوی پەی بەرێت کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی بانگەوازو گەیاندنی مەبەست و نیـــــازە ئیسلامی یەکان بەخەڵکی و قەڵاچۆ کردنـــی کاری خراپ و ناهەموارى پێویستی یەکـــی شەرعی‌یەو بەر پرسیاری‌یەکی تاکە کەسی یـە و لە ئەستۆی دایەو تەنها بەوەندەش لـــە ئەستۆی نابێتەوە ئەگەر ئەندامی گروپێکـــی ئیسلامی بێت یاخود هاو ڕەوتی بێت و لـــە خولگەی دابسووڕێتەوە....

بەر پرسیاری کاری ئیسلامی لەسەرهەمو موسڵمانێک پێویستە سا ئیتربزوتنەوەیەکیش لە ئارادابـــێ یان نـــا .

لێرەشەوە نیاز لە ڕێکخراوە ئیسلامـی یەکان وەرگرتنی چالاکی‌یە تاکە کەسییە کانە پەرە پێدان و ئاراستە کردنیانەو ئینجـــا شان بەشانی کات و زەمان .. گۆرینی ئـــەو چالاکی یانەیە بۆ وزەیەکی قەبەو گەورەی وەها کە بتوانێت ڕوو بەڕووی ئەو مەسەلەگەورانە بووەستێت کە گشت تاکە کەسەکان بەتەنیاو دوور لە ڕێکخراو هیچ وزەو توانایەکیان نی‌یە لەسەر ڕوو بەڕوو بوونەوەیان .

شێوەکانی دواندنی تاکە کەسی کەشێوازی قورئانی و پێغەمبەری خوازیارو داواکاری‌بون بەرپرسیاری تاکە کەسی لە هەڵگرتنی بـــاری بانگەوازی ئیسلامی دا دووپات دەکاتەوەو.... دەیچەسپێنێت.

لە .م بارەیەوە چەند نمونەیەک‌دەخەینە ڕوو.. لە قورئان و لە سوننەت.. خوای مەزن فەرموویەتی :

(( و مَن احسنُ قولاً مِمَن دعا اِلیٰ اَللّهِ وَ عَمَل صالحا وَقال اِننی مِنَ المسلمین)).

واتە :( کێ گفتارو وتەی لەوکەسە جوان ترە کە بانگەوازی بۆ لای خوای گەورە کردووە و گوتوویەتی من لە موسڵمانانـــم ).

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی:

(( فلذلک فأدع واَستقم کما اُمرت ولا تتبع اهـواءهـم )).

واتە :(بۆ خوداو بەرنامەکەی بانگەوا ز بکەو بەردەوام و جێگیر بە.. لەسەر ئاینـــی خوداو دوای هەواو ئارەزووی بێ باوەڕان مەکە ـ وە ) . هەرلەم بارەیەوە خوای میهرەبان فەرموویەتـی :

(( ادع الیٰ سَبیلِ رَبِّک بالحِکمَةِ وَالمَوعِظةِ الحَسَنة))..

واتە:( بانگەواز بکە بۆ سەر ڕێگــــا ی پەروەردگارت.. بە دانایی و پەندو ئامۆژگاری جـــوان ).

دیسان خودا لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

(( وَادع الیٰ رَبِّک اِنک لَعلیٰهُدی مُستَقیمْ)).

واتە:( بانگەواز بکە بۆ لای خــــوای پەروەردگارت.. چونکە بێگومان تۆلەسە ر ڕێگایەکی ڕاستیت ) .

لە فەرموودەکانی پیغەمبەریش( صَلَّـــی اللّه علیەوَسلَم) ئەم نموونانە دیاری دەکەین هەروەک فەرموویەتی :

(( مَن رأی مِنکُم مُنکَراً فَلیُغَیِرە بیدە فان لم یستطع فبلسانە فان لم یستطع فبقلبـە و ذلک اضعف الایمـان)).

لەمەو پێش لە باسی (( پێویست بوونی بانگەواز بۆ ئیســلام)) دا مانای ئـــــەم فەرموودەیەمان بە کوردی لیک دایەوە.......

٥

* * * * * * *

هەر لەم بارەیەوە پێغەمبەر ـ صلى‌الله علیەوسلم) ـ فەرموویەتی :( **كُلكُم راعٍ وكُلكُمُ مَسوءولٌ عَن رَعِیتِــه**)).. واتــە : ( هەریەكـــە لە ئیوەی موسڵمان سەرپەرشتكـارەو هـــەر هەمووشتان بەرپرسیارن لە سەرپەرشتكراوەكا ـ نتـــان )) .

زۆر كەس لەوانەی لە بواری ئیسلامی‌دا كار دەكەن.. لەوانەیە بەهەڵە،وەها تێبگەن.. لەوەی كە ئەركی راپەراندنی كاروباروفەرمانە ـ كانی پەیوەندی تاكنە كەسی و بلاو كردنەوەی بانگەواز تەنها هەر لەسەر ئەوانەیە كـــە دەیانەوێتبەرگری‌لێ بكەن... یان زانست و.. زانیاری زۆریان هەیەو بۆ بەدەست هێنانـــی ئەم زانست و زانیاریانەش... دەبێت قـــوڵ ببنەوە لە توێژینەوەو لێكدانەوەی زانستەكانی قورئان و فەرمودەو زاراوەكانیان و زانســـتە ـ كانـــی شەریعەت و بنەماو لقەكانیدا جگـە لە رۆشنبیری كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی كە ئەمەش بۆ هەموو كەسێك نالوێت تەنهـا بۆ چەند كەسێكی كەم نەبێت لەوانەی كەبارو دۆخ و وزەو توانایـان رێگای پێ دەدەن...

زۆر كەس وا تێدەگەن كە بانگەوازهـــەر كاری ئەم كەسانەیەكە باسمان كردن.

بەڕای من مەسەلەكە زۆر لەوە ئاسانترە برای بانگخواز ئەگەر لایەنەكانی تێگەیشتنـی لە ئیسلام تەواو بێت و لە توانای دابیـــت بە شێوەیەكی روون و ئاشكراو سوك و ئاسان ئەو تێگەیشتنە دەربرێت ، ئەوا ئیتر دەبێت پێ بخاتە سەر یەكەم هەنگاوی رێگاكەو وەك بانگ خوازێك دەست بە كارەكانی سەرشانـی بكات.. بەڵام بەسێ مەرج :ـ

١) بزانێت سنووری خۆی لە زانســـــتو زانیاری چەندەو لە رووبەری ئــــە و سنوورەدا و بەگوێرەی پلەو ئاستی خۆی‌كاربكات.

٢) دەبێت هەڵس و كەوتی بگونجێنێت‌لەگەڵ ئەو بیرو فیكرانەدا كە خەڵكی بانگ دەكـــات بۆ لایـــان .



٣) دەبێت هەوڵ بدات بۆ پەرەپێدانـــــــی رۆشنبیری یە ئیسلامی یەكەی و بە هۆیـــەوە بە تێپەر بوونی كات خۆی پێ بگەیەنێتـــــە ئەوئاستە باشەی كە رەوانبێژی و كراوەیی بەرهەمی پتری پێ دەبەخشێت.

كەواتە گرنگ ئەوەیە كاری بانگەواز دەست پێ بكات ... دەستپێكردنیش( وەك هەموو دەستپێكردنێكی تر) لەوانەیـــــــە گیرو گرفتێكی گەورە بێت دەرهەق بە هەر كارێك .

جا ئەگەر مرۆڤ ئەو قۆناغەی بـــڕی ئەوا وردە وردە هەموو بەربەست و گرێ‌و تەگەرەكانی تر یەك لە دوای یەك لە ناو دەچن و نامێنن و ئینجا بەرهەمەئیسلامی ـ یەكەش رۆژ بە رۆژ لە بەرز بوونەوە دا دەبیـــت .

**(( چەند كوسپێك لەسەر رێگـــا ))**

لەمەو پێش ئەنجامی بانگـــەوازی زۆربەی خەڵك بێ بەرو راوەســـتاو و گۆشەگیر دەرچوو... من لەو زیانی‌بـــسەر نەگرتن و نەزۆكی و راوەستان و گۆشـــــە گیری یەدا ( كە توشی زۆر كەس لەئەندامانی رێكخراوە حەرەكی‌یەكان بوون)تەنهـــا یەك هۆ بەدی دەكەم ئەویش زیاد بوونی ترس‌و سامیانە لە خەڵكی و لە كۆمەڵگـــە.

سا ئیتر لەوانەیە ئەوان متمانەیــــــان بە خۆیان لاواز بووبێت‌و دەبێت.. لەمە و لاش لەم لایەنەوە چارەسەری خۆیان بكە ن یان لە ژیانیان ترساونو ژیانی خۆیان لە سزاو ئازاردان دوور دەخەنەوە.

كەمترین وەسف كەدەربارەیان‌بوترێ ئەوەیە (( ئەوان لاوازو ترسنۆكـــــــن). بویەپێویستیان بە چارەسەرو تیماركردنە پێش ئەوەی تەرخان بكرێن بۆ تیماروچارە سەركردنی خەڵكی ... یان لەوانەیە ئەوان

خاوەنی بەرژەوەندی دنیایی بوبن و زیادە ڕۆییان کردبێت لە پاراستنی دا... تەنانە ئەگەر لەسەر حسابی ئیسلامیش بووبێت..

هەرگیز نابێت ئەو ترسان و سام کردنەیان لە خەڵکی... ڕەوشتێک بێت لە ڕەوشتی باوەڕداران، چونکە باوەڕ بەپێی سروشتی خۆی جورئەت و چاو قایمی لە دەربڕینی حەق دا بۆ مرۆڤ دەستە بەر دەکات و وای لێ دەکات ئازایەتی تیدا پەیدا ببێت ، فەرمایشتەکەی خودای مەزن ئەم ڕاستییەی دووپات کرد ۆتەوە..

هەروەک دەفەرموێت :

**(( الذينَ قالَ لَهُم النَّاسُ إنَّ النّاسَ قَد جَمَعُوا لَكُم فاخشَوهُم فزادهُم إيماناً وقالوا حَسبُنا اللّه و نِعمَ الوَكيل. فانقلبوا بنعمةٍ مِنَ اللّه وَفضلٍ لَم يَمسَسهُم سوءٌ)).**

**واتە: ئەو کەسانەی بەدەم بانگەوازی خودا و پێغەمبەرەوە هاتوون ئەوانەن ئەگەر چەند کەسێک پێیان بڵێن:" ئەوا خەڵکێکی زۆرو سوپایەکی گەورە کۆکراونەتەوەوئامادە کراون لە دژی ئێوەو ناتوانن بەرەنگاریان ببنەوە و دەبێت لێیان بترسن" ئەوانیش لە بەرامبەر ئەو هەڕەشانەدا باوەڕییان زیاد دەبێت و پتر پابەند دەبن بە ئاینەکەیانەوەودەڵێن:"ئێمە هەر خودامان بەسە بۆ پشتگیری لێ کردنمان و کارو بارمان دەدەینە دەست ئەو وهەر خۆی.... باشترین پشت پێ بەستراوە".**

ئنجا ئەو خاوەن باوەڕە پشت بە خوا بەستوانەبەسەر کەوتووی دەگەڕێنەوەوهیچ خراپەو شەر خوازییەکی دوژمنانیانزیانیان پێناگەیەنێ و کاریان تێ ناکات).

پێغەمبەریش - صلی‌اللەعلیەوسلم - ئامازەی بۆ مەبەستی ئەم ئایەتە کردووە. فەرموویەتی :( أُمِرتُ اٴن أقولَ الحَق وَلو كان مُرّا )... واتە: ( من فەرمانم پێکراوە کە هەر حەق بڵێم و لەسەر حەق سوور بم سەرباری ئەوەی ئەگەر تاڵیش بێت).

هەروەها پێغەمبەر صلی اللەعلیە وسلم فەرموویەتی :- ( امرت ان اٴقول.... الحَقَ وَلا اٴخشىٰ في اللّه لَومةَ لائم)..

واتە: فەرمانم پێ کراوە کە هەر هەق بڵێم و لە ئاینی خوداش دا لەسەرزەنشتی سەرزەنشتکارێک نەترسم).

هەڵاتن و دەرباز بوون لە جەنگ و کێشەکە ڕەوشتی ئەوکەسە گوماندارو سڵکەرو ڕاڕایانەیە کە بێ ئاگان لەم فەرمایشتەی خوا : ( قُل لَن يُصيبَنا إلا ماكَتَبَ اللّهُ لَنا هُوَ مَولانا وَعلىٰ اللّهِ فليَتَوكَّلِ المؤمنون).. واتە: ( ئەی پیغەمبەر بڵێ: هیچ کارە سات و تەنگ و چەڵەمەیەک.... ڕوومان تێ ناکات مەگەر ئەوە نەبێت کە خودا خۆی لەسەرمانی نوسیوەو هەر. خوداش سەرپەرشتیارمانەو دەبا خاوەن باوەڕان پشت بەخوا ببەستن).

هەروەها ڕاکردن و هەڵاتن لەجەنگ و دوو بەرەکی نێوان هەق و ناهەق نەریتی ئەو کەسانەیە کەوا تێدەگەن کوایە قەڵا و شورای قایمیان بەربەست و پارێزەریان دەبێت لە خوداو قەدەری خوداو هەربۆیە فەرمایشتەکەی خوداشیان لەبیر چۆتەوە کە فەرمویە :( اٴینما تَكونوا يُدركُكم اٴلمَوت وَلَو كُنتم في بروجٍ مُشيَّدة)...

واتە:( لە هەر شوێنێک دابن مردن هەر پێتان دەگات تەنانەت ئەگەر لە چەند قەڵایەکی سەخت و پتەویش دا بن).

قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو جۆرە کەسانەو هاو شێوەکانیان کردووە.. لەمئایە - تەدا :- ( **الذين قالوا لاخوانهم وقعد وا لو اطاعونا ماقتلوا، قل فادرءوا عن انفسكم الموت ان كنتم صادقين**)..

**واتەئەو کەسانەی کەنەچوون بۆ جەنگ و کوشتاری بێ باوەڕان و لەماڵەوەدانیشتن دەربارەی برا جیهاد کەرەکانیان گوتیان: (( ئەگەر نەچونایە بۆ جەنگ و گوێرایەڵی ئێمەیان بکردایە نەدەکوژران)) .**

**جا توش ئەی پێغەمبە ر بەوەدووڕووانە بڵێ : " دەباشە ئەگەر ڕاست دەکەنمردنلە خۆتان دوور بخەنەوەو خۆتانی لێ بپارێزن کاتێک یەخەتان دەگرێت).**

و هەروەها خودای مەزن فەرموویەتی :
**((قل إنّ الموت الذی تفرون منه فانه ملاقیکم ثم تردون الی عالم الغیب والشهادة فینبئکم بما کنتم تعملون)).**
**واتە:( ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: ئەو مردنەی ئێوە لەترسی رادەکەن هەر پێتان دەگات و پاشان دەگەڕێنرێنەوەبۆلای خودایەک کە ئاگای لە نادیارو لەدیار هەیە ئینجا هەواڵی کردارو رەفتارتان پێ رادەگەیەنێ)).**

ئەو کەسانەی کەلەبەر بەرژەوەندی و رزق و رۆزییان لە کاری ئیسلامی دەترسن و سڵی لێ دەکەنەوە،کە هەزار حساب و پێوا بۆ ئەو مەسەلەیە دەکەن .. ئەوانە تەنها بەندەی سەرشۆڕی ژیانی سەر زەوی و بەند لاشەی زەوین .. جا واباشە بۆیان کە خۆیان رزگار بکەن لە هەموو ئەو کۆت و پێوەندا -نەی جم و جوڵیان دەوەستێنێت و چالاکی -یان رادەگرێت...

ئەوکەسەی سەرەرای ئەوەی کەلەسەری.. پێویستە کار بۆ ئیسلام بکات و خەڵکی رابکێشێت بۆ لای جوڵانەوەکە ، بەڵام خۆ نابێت بەشی خۆی لە دنیا لەبیر بکات ئەمەش بۆ بەجێ هێنانی فەرمایشتەکەی... خودا :(( وابتغ فیما آتاک الله الدار الآخرة ولا تنس نصیبک من الدنیا واحسن کما احسن الله الیک))...

**واتە : هەوڵ بدە بۆ ئەو دەستکەوتە گەورەو نەبراوەیەی کە خوا لە رۆژیدواییدا بۆی داناویت و بەڵام بەشی خۆیشت لە دنیا لە یاد نەچێت( بەشی خۆت ... نەک بەشی چەندان کەسی تریش بخۆیت). هەروەها چاکە بکە هەروەک چۆن خودا چاکەی لەگەڵدا کردویت).**

بەڵام خۆ ئەو دەستکەوت و قازانجەی لە کاری رۆژانە بەدەستی دەهێنیت،دەبێت لە گیرفانی دابێت نەک لە دڵی داو تەرخا -نی بکات بۆ خێرو چاکە.. نەک بۆ خراپە . هەروەها نابێت سەرکردنە سەر کاری رۆژانەو پەیداکردنی بژێوی گوزەرانو دۆکاریک بێت بۆ روو وەرچەرخان لەجیهاد لەرێی خوادا .




ئاشکرا و دیارە کە بەرنامەی پاکی پەروەردگاری پاك و بێ گەرد و بێ کەم وکوری هەمە لایەنە(( اکملت لکم دینکم )) لە بەرهەمە لایەنی ئەو دینە سەنگینە ناکونجێ بڵێین تەنها بریتی یە لە جێ بەجێ کردنی چەند روکنێك و پایەیەك . بەڵکو بە شێوەیەکی شمولی و بەجێ بەجێ کردنی هەموو فرمان و بریارەکانی خودا،ئەو راستیە روونە دەردەکەوێ کە ئەویش شمولیەتی ئیسلامە .

زۆر جار گوێ بیست دەبین کە ناحەز و داخ لە دڵانی بەرنامەی خوا ، ئەو دینە بە ووشك و رەق دادەنێن ، هەروەکو هولاکوی ئەم سەردەمەی عێراق بە ووشەی (( متحجر )) ناوی بردووە کە پێی وایە ناکونجێ لە گەڵ ئەم سەردەمەدا .

ئەم بەرنامەیە کە خوای مەزن ناردوویەتی بۆ سەر زەوی بو رێنوێنی دانیشتوانی سەر ئەو ئەستیرەیەکە شارێکەی ژیانیان نیشان بدات و لە تاریکی و توولە رێگاکانی نەزانی سەرفرازیان بکات .کەواتە یەکێ لە

جیاکەرەوە و مومەیزاتی ئەم دینە کۆمەڵایەتیە (( اجتماعیه )) و دوورە لەکەنار گەیبیری و خۆ وەلاگرتن ، ئەوەتا پەروەردگـــاری بەخشندە و میهرەبان توجیهات و ئاگاداری و بریاراتی خۆی هەر ئاراستەی بـــرواداران ناکات بە تایبەتی و خەڵکانی تر نەگریتەوە ، بۆیە دەبینین ووشەی (( أیُّهَا النّاس )) ۲۸ جار و (( الناس )) ۲٤۹ جـــار و (( الانسـان )) ٦۱ جار دوبارە کراونەتەوە لە قورئانـی پیـروزدا .

دیارە خوای کار بەجێ گەرەکیەتـــی بەرنامەکەی بگەیەنرێ بە هەموو چیـــن و توویژەکانی کۆمەڵ و تێکەڵاویان بێ ئەمەش لەرێکەی پێغەمبەری پێشەوا مانەوە ( صلی الله علیه و سلم ) بۆئەوەی بیر و فکرەیـان هەڵسەنگێنێ و راستیان بکاتەوە لە هۆش و بیری ژەنگاوی و چاو بەستەکی .

سەروەر و مامۆستای مرۆڤایەتی محمد ( صلی الله علیه وسلم ) لە فەرموودەیەکـی پیرۆزدا کە ( ابی عماره البراء بن عـازب ) خوای لێ رازی بێ گێراویەتەوە و دەڵـێ : (( أمرنا رسول الله صلی الله علیه وسلـم بسبع : " بعیادة المریض و اتباع الجنائز و تشمیت العاطس و نصر الضعیف و عـون المظلوم و افشاء السلام و ابرار القسم " )) . متفق علیـه

لەم فەرموودە بەنرخەدا ئەوە بـــەدی دەکەین کە پێویستە برواداران وەکـــو کۆشکێکی لە قورقوشم دروست کراو بن و لە هەموو کات و سـاتەکاندا ئاگاداری یەکتری بن چ لە کاتی شەر و ئاشتیدا .. یان لـە کاتی خوشی و ناخوشی دا واتە لە هەمـــوو زروفەکاندا ئاگا بوون و پەیوەندی لەگـــەڵ یەکتری نەك لە کاتی خوشی و ئاشتـــی دا سەلام و هاتووچوی گەرم و لە کاتی تەنگانەش دا ئەستیرەی سیوەیل ، بەڵکو لە هەمـــوو بارودۆخەکاندا دیار و ئاگا لە یەکتر بەلـــێ زانی ئەوەتا لە فەرموودەی بە پیـــــــزی پێغەمبەردا کە لە پێشەوە نوسیومانە ئیشارە بەوە دەکات کە پێویستە سەر لە نەخـــوش بدریت و دلی بدرێتەوە و نزای خێری بو بکرێت تا بە سەلامەتی بگەریتەوە سەر تەندروستی جارانی ، هەروەها ئەم هاتوچوونە هــــەر سەردەمی زیندوویەتی و ژیان ناگرێتـــەوە بەڵکو لە کاتی مردن و دوای مردنیـــش دا دەبـی ئەنجـام بدرێ کە " اتباع الجنائز "٥ واتە لەگەل مردوو چوون بەرەو گۆرستانـــی مردووان کە ئەمە لووتکەی تێکەڵاوێتـــی و ئاوداری پەیوەندی نیوان پرواداران و خەڵــك دەگرێتەوە هەر لە سەرەتای هاتنە دنیـــاوە تا مردن و چوون بەرە و یەکەم قوناغی جیهانـی ئەودیوو کە قەبرە .

هەروەها سەرخستنی لاواز و لاوازکراوان و یارمەتی بێدەسەڵاتان و چەوسـاوان و لابردنـی نیری زوڵم و ستەم لەسەر شانیـــان ئەرکی مسولمانانە ، کە ئەمەش مانــــای رابوون و هەڵسـانە بە شۆرش دژی چەوساندنەوە بە هەموو شێوەکانی یــــەوە وەك چەوسانەوەی توێژێك یان چینێك لە لایـەن چیـن و تویزیکی ترەوە یا چەوساندنـــەوەی نەتەوایەتی و .. هتـد... ، لەو کاتانـــەدا ئەگـەر شوێن کەوتوانی راستەقینەی دینـی خوا لابردنی ئە و چەوساندنەوەیە بـــــە ئەرکی خۆیانی ئەزانن و پێ ی هەل ئە هەســن و شورش ئەکەن بو رزگارکردنی چەوساوەکان و بەرقەرار کردنی ژیانێکی ئاسودەیـــی بۆیان ئەوا ئەو کاتە خەڵکانی فیکرە نامـــۆ بە گەل و بیری گەل خولیان دەکەنە خاوەنـــی

قەزیەکە هەر بۆیەش بیری کومونیزم لــــە کوتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان دا بەفراوانی ولاتمانی گرتەوە ، لیرەدا هەولی دان بۆ نەهیشتنی چەوساندنەوە گرنگـــی دانە بە کیشەکان بەگشتی و کیشـــــەی کومەلایەتی یەکان بەتایبەتی و ریگــــە گرتنیشە لە خەلکانی بودەلە کە خۆبەکەنــە خاوەنی مەسەلەکان و خو بخزیننە ناویــەوە .

دیـان مەسەلەی سەلام کردن لە ناسیـاو و نەناسیا و کە لە فەرموودەکە دا هاتـــووە دەرگا کردنەوەیە بۆ گفتوگۆ کردن و لیـك نزیك بوونەوە و لابردنی پەردەی گومـــان و کینە بەرامبەر یەکتری ، کەواتە دینـــی خواوەند هەموو ریگەکان دەگرێتەبەرخــۆ بۆ چەسپاندنی گیانی تەبایی و پتەوبوونـــی پەیوەندی یە کومەلایەتی یەکان .

پیشەوامان فەرموویەتی :

**(( الجماعة رحمه و الفرقه عذاب ))**

واتە هەمیشە کۆمەل و لیك نزیکی لە سەر بیری پەروەردگاری رەحمەت و بەرەکەت و خۆشی یە بەلام پیچەوانەکەی سزا و ئازار و نارەحەتی یە ، وە خوای گەورەش روو لە پیغەمبــــەر ( صلی الله علیه وسلم ) دەکات و پـــیی دەفەرمـــوی :

**(( لو کنت فظا غلیظ القلب لانفضـــوا من حولـــك ))**

پەروەردگار دەیەوی پیشەوای مسولمانان و شوینکەوتوانی دینەکەی دل نەرم و کـراوەو روو خۆش بن تا خەلك لە دەوریان کـــــو ببیتەوە نەك بە پیچەوانەوە ، وە گورگیـــش هەمیشە مەری لاوەکی و دابراو لە میگـــــەل دەخوات .

لە روانگەی ئەم فەرمایشتە ناوازانـــەی خوای پەروەردگار و پیغەمبەرەکەی ( صلـــی الله علیه و سلم ) ەوە دەگەینە ئەو ئەنجامـــەی ئەگەر خەلکانی چاك و کردەوە راست لە سەر بنچینەی بیری پاکی ئیلاهی لیك نزیـــــك بکەونەوە و فرمانەکانی ئەو وەك خـــۆی جیبەجی بکەن کۆمەلگەیەکی ئاســـــوودەو کامەران لەم جیهانەدا دیتە کایەوە و لــــە جیهانی ئەو دیویشدا سەر فرازو خـــوش بەخت دەبن .

ئاواتە خوازیشین کە هەموو چیـــــن و توویژەکانی گەلی کوردمان هەرچی زووتر و خیراترە بە دەم بانگەوازی حەقی خـــوا و پیغەمبەرەوە بچن و بە کردەوە لە هەمـــــوو بوارەکانی ژیان دا ئەنجامیان بدەن تـــا رزگاریان بیت لە تەواوی کیشەکان و کیشە و دەردە کۆمەلایەتی یەکان بە تایبەتـــی و رەواندنەوەی ئەو تەم و مژ و هەورە رەشـــەی کە داخ لەدل و پیلان گیرانی دژ بە ئیســـلام هیناویانەتە کایەوە .

باوکی مەروان ( قەلادزێ )



# مافی هاوبەشی لەنێوان ژن و مێردا

«بەشی یەکەم»

سەردار رەزا

**کاتێک** کە هەریەکە لە ژن و مێرد ژیانی هاوسەرێتی دروست دەکەن ،بێگومان ئەم لایەیە لە ئەنجامی پێویستی بوونی هەریەکە لەو دوو هاوسەرەیە بە چەند شتێکی ماددی و مەعنەوی و ئەم بەیەک گەیشتنە حەلال و شەرعی یە حیکمەت و .. سوودی زۆر هەیە بۆ مرۆڤایەتی کە لە زنجیرەکانی پێشوودا .. بەکورتی باسمان لێ کردن....

هەروەکو وتمان لەدروست کرد نی ئەم لایەدا دەبێت جێ بەجێ کردنی هەندێ خاڵ و وتەو کرداری تیابێت تاکو ئەو خێزانە بە ئارامی بژین و بەردەوامی یەکی سەرکەوتوانە وەربگرێت....

بۆ ئەم مەبەستەش مافی پیاو لە پەیرەوی ئیسلامدا بۆ ئەم لایە تازەیە دیاری کراوە... بە هەمان شێوەش مافی ژنەکە دیاری کراوە... کە بەیارمەتی خوای گەورە لەداهاتوودا لەسەریان دەنوسین کە لە ئیسلام وەرگیراوە ...

لەم بەشەدا باس لەو مافانە دەکەین کە پیاو و ئافرەتەکە هەردوکیان تیایدا هاوبەشن....

یەکەم : مافی لەزەت وەرگرتن و رابواردنی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوی تریاندا.. هەریەکە لە ژن و مێرد مافی ئەوەی هەیە کە لەزەت و خۆشی ژن و مێردایەتی لە هاوسەرەکەی وەربگرێت.. هەر کاتێک ویستی و ئارەزووی کرد.. بەمەرجێ رێگر و بەربەستێکی شەرعی لەبەردەم دا نەبێت وەکو نەخۆشی ... یان حەیز یان شتێکی تری لەم بابەتانەو هاوچەشنانە.

ئەگەر بارو دۆخیان ئاسایی بێت.... ئەوا بۆ هیچیان نی یە لە سنووری ئیسلام دا قەدەغەی ئەم کارە لەوی تریان بکات

پێویستە لەسەر ژن و مێرد کە لەم خاڵەدا هەریەکەیان مافی ئەوی تریان بدا چونکە هەردوکیان ئەم مافەیان هەیەبەسەر ئەوی تریاندا...

ئیبن عەباس- رەزای خوای لێبێ - دەفەرموێ : من پێم خۆشە کەخۆم بۆ ژنە -کەم برازێنمەوە .. هەروەکو پێم خۆشەکە ژنەکەم خۆیم بۆ برازێنێتەوە ...

لێرەدا ئەوە دەردەکەوێ کە پێویستە ژن و مێرد هەردوکیان خۆیان بۆ یەکتر برازێننەوە تا هەردوکیان ئارام و دڵشادو رازاوەو پاک و خاوێن بن... تا زیاتر سوود لە یەکتری وەرگرن .

بێگومان کاری ژن و مێردایەتی لە ژیانی هاوسەرێتی دا هەروا کەم نی یە و کارو کاردانەوەی هەیە بۆ ئەو ژن و مێردە دەبێ هەریەکیان رعایەتی ئەوی تریان بکەن

زانایانی شەرع زانی لەسەر ئەوەرێک کەوتوون کە پەیوەندی جنسی ئەرکە لەسەر مێردەکە کە دەبێ رعایەتی بکات..

بەڵام لە دیاری کردنی کارەکەدا جیا - وازییان هەیە.. ئەبو حەنیفە وتویەتی.. لە هەندی گێرانەوەدا کە لێی دەگێرنەوە- دەڵێ پیاو دەبێ هەر چوار شەو جارێک پەیوەندی جنسی بکات بە ژنەکەیەوە ..

- بروانە حاشیەی کتیبی /الزواج الاسلامی السعید - رعد کامل مصطفی الحیالی /ل٧٩ کە تیایدا دەست نیشانی ( فتح القدیر ) لابن همام ... ٥١٨/٢ ی کردووە .

ئەم دیاری کردنانەش هەموویان پاڵپشتیان هەیە....

کەعبی کوڕی سور دەگێڕێتەوەو دەڵێ: لەگەڵ عومەردا دانیشتبووم - ڕەزای خوای لێ بێ - ئافرەتێک هات و گوتی :
ئەی ئەمیری موسڵمانان مێردەکەم بەڕۆژ بەڕۆژووەو بە شەویش بە نوێژ کردنەوە خەریکە .. منیش پێم خۆش نییە کە شکاتی لێ بکەم ... ئەو بە کوێرایەڵی و خواپەرستی

- بەوە خەریکە .

کاتێک کە عومەر کوێی لێ گرت ، کەعب دەڵێ : ئەی ئەمیری موسڵمانان ئەو ..... ئافرەتە شکات لە مێردەکەی دەکات بەهۆی دووری یەوە لە سەر جێگەی ژن و مێردایەتییات ....

عومەر فەرمووی : چۆن ؟
کەعب وتی : ئەگەر مێردەکەی بەڕۆژبەڕۆژوو بێت و شەوانیش هەر خەریکی نوێژ کردن بێت ... ئیتر کوا مەجالی دەبێت کە لەگەڵ ژنەکەیدا بێت ؟

لە پاش دا حەزرەتی عومەر فەرمووی وا لێیان تی گەیشتی فەرموو فەرمان بدە.. کەعب وتی : با مێردەکەی بێتە ئێرە.... کەعب بە مێردەکەی گوت :
ئەوە ژنەکەت شکاتی لێ کردووی.. مێردی ژنەکە وتی لە بارەی خواردنەوە یان لە بارەی خواردنەوەوە ... وتی نەخێر ..

لەپاش ئەوە ی کە کەعب داوەری.. کردلە بەینی ژن و مێردەکەداکە دەبێت... هەموو ڕۆژێک بەڕۆژوو نەبێت( ڕۆژوی.. سونەت بوو) بەڵکو با سێ ڕۆژ بەڕۆژووبێت و ڕۆژێک بەڕۆژوو نەبێت... خەلیفە عومەر داد وەریەکەی کەعبی پێ چاک بوو

• بڕوانە الزواج الاسلامی السعید ل٨٠ دەستت نیشانی( المغنی - لابن قدامە لەگەڵ الشرح الکبیر ج٨ص١٤٣). هەروەها فقه السنه : ٢/١٩٠ . ی کردووە .

هەندێ لەشەرع زانەکان پیاویان .... پەیوەست کردووە کە بەلایەنی کەمەوە هەر چوار مانگ جارێک پەیوەندی جنسی بکات بە ژنەکەیەوە .

کە پشتیان بەم ئایەتە پیرۆزەی خوا بەستووە کە لە قور ئاندا فەرمویەتی:
**(( للذین یؤلون فی نسائهم تربص اربعة اشهر فان فاؤا فان الله غفور رحیم))**
**- سورة البقرة / ٢٢٦ .**
**هەندێ** لە شەرع زانەکان دەڵێن :
مێردی ئافرەت پەیوەست نییە لەبەو ماوانەی کە دەچێت بەلای ژنەکەی دەدیاری کراو نییە .. و بەڵکو با مێردەکە پەیوەندی جنسی لەگەڵ ژنەکەی خۆیدا بکات بەپێی پێویستی کە دەیان پارێزێ و لە حەرام... دووریان دەخاتەوە .

پێویستە لەسەر ژنیش کە قەدەغەی.. خۆی نەکات لە مێردەکەی ئەگەر خاوێن بوو لە حەیزو هاو وێنەی... ئەگەر بەربەستی شەرعی نەبوو... هەروەکو لەکاتی خۆی دا باس دەکرێن......

هەروەکو لە ئومو سەلەمەوە - ڕەزای خوای لێبێ وتی : **پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم** فەرموویەتی :

**(( ایما امراة ماتت وزوجها عنها راض دخلت الجنه))** رواه الترمذی وقال حدیث حسن .

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە:
**(( اذا باتت المراة هاجرة فراش زوجها لعنتها الملائكة حتی تصبح)) متفق علیه**
واتە : ئەگەر ژنێک شوێنی سەرجێی ژن و مێردایەتی بە جێ هێشت و مێردەکەی دڵی پەشا لێی ئەوا فریشتەکانی خوای گەورە نەفرین لەو ژنە دەکەن تاوەکو واز لەو کارەی دێنێ و تەوبەدەکات و دەگەڕێتەوە بۆ کوێ ڕایەڵی مێردەکەی.

ئەگەر ئافرەتێک گوێ ڕایەڵی مێردەکە نەکات لە کاری سەرجێی دا ئەوا چاکوایە تێبینی یەکێ لەم خاڵانە بکات :-

(١) لەوانەیە ژنەکە نەیەوێت سەرجێی لەگەڵ مێردەکەی خۆی دا بکات مێردەکەی خۆش نەوێت و حەز ندکات کە پەیوەندی... جنسی لەگەڵدا ببەستێ..
ئەم کارەی ئافرەتەکە هەمیشەیی یە و پەیوەندی نییە بە کارو کاتێکی دیاریکراوە - وە .. ئەم حاڵەتە بەردەوامی نادات بە پەیوەندی و خوشەویستی ژن و میردایەتی و چاک وایە ڕێگای سروشتی خۆی بگرێ و لێک جیا ببنەوە . ئەم کارەش پەیوەندی بە ئافرەتەکەوە هەیە .

(٢)یان ژنەکە مێردەکەی خۆی خۆش دەوێت.. بەڵام هەر بە تەبیعەت .. حەز لە کاری جنسی ناکات و لە جنس دوور دەکەوێتەوە.
ئەمەش خواربوونەوەیە بەڵام ئەم حاڵەتە لە واقیعی ژیاندا هەیەو .....
ئەم حاڵەتەش هەر هەمیشەییەو گەرچی ژنەکە مێردەکەی خۆشی خۆش دەوێت.. بەڵام بە تەبیعەت ئارەزووی جنسی نی یەو چا ک وایە ئەو ژن و مێردە بەبێ پێچ و پەنا بکەنە ڕێک کەوتنێکی باش و چەسپاو:
یان دەبێت مێردەکە ئەم وەزعە قبوڵ بکات و خۆی توشی قورسی و نارەحەتی بکا بەوەی کە پێویستی جنسی بۆ جێ بەجێ نابێت و هەر چەندێکی کە گران دەکەوێت لە سەری ... خۆیبکرێ کەر ژنەکەی لەگەڵ دڵنیا ندبوو لە کاری سەر جێیدا.
یان پیویستە ژنەکە خۆڕبێت و ئازار و نارەحەتی قبوڵ بکات و دڵی مێردەکەی ڕازی بکات ... لە جنس دا لەگەڵیا بیێت تا لە ژیانیا سەرکەوتووبێ .
یا خود کارەکەیان دەکەوێتە دەستی.. یاساوەو یاساش داوا لە ئافرەتەکە دەکات کە گوێ ڕایەڵی مێردەکەی بکات لە کاری...

سەر جیی دا چونکە ئەو مێردە پێویستی جنسی هەیەو مانەوەی بەو شێوەیە دوورنیە کە بەرەو لاربوونەوەی ڕەوشتی بەرێت ...... یان هەڵدەستی بە هێنانی ژنێکی تر بەسەر ژنەکەیدا... کە ژنیش ئەم کارەیان پێ خوش نییە ... جا چاک وایە چارەسەری ئەم وەزعە لە بناغەوەبێت تا ژیانی ئەو ژن و مێردە بەردەوامییەکی بەختەوەرانە وەرگرێ

(٣) یان ژنەکە مێردەکەی خۆی خۆشدەوێ.. لەدەستیشی ڕاناکات و لە کا ری سەرجێی بێزار نی یە .. بەڵام لەو کاتەدا نایەوێت..
ئەم حاڵەتە ماوەکەی کورتەو چارەسەر ئاسانە.... ئەم ڕاکردنەش لە جنس کاریکی وەختی یە و بە هۆی هیلاک بوون و بێ تاقەتی یەوەیە یان مێشک مەشغولی یەوەرووەدات...
بەڵام ئامادە بوونێکی دەرو ونیولاشەیی ئەم وەزعە دەگورێت و حاڵەتەکە زۆر ئاسان دەبێتەوە..
بۆیە پێغەمبەری خوا - صلی‌اللەعلیە وسلم - گرنسی بە ئاراستە کردنی پیاوان... داوە بەوەی کە لە کاتی سەرجێیدا ژنەکانیان بلاوێنن و زۆر بە نەرمی و رووخۆشی و وردە دەست جولان و قسەو ماچ کردن لەگەڵیان بجولێنەوە تا هەردوولا ئامادەبوونی ژیانی و لاشەیی و دەروونی ببرو هوشی یان تیا دروست ببێت و ئەو بێ تاقەتی و سستی یە نەمێنێ ....

- بڕوانە الزواج الاسلامي السعيد لاپەرە/٨١ ئاماژەی بۆ کتێبی شبهات حول الاسلام لاپەرە/١١٢ - ١١٤. کردووە.

پێش ئەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین تیبینی یەک هەیە کە پێویستە زۆر بە وریایی یەوە گرنگی پێ بدرێت .. کە زۆربەی [illegible] بۆ ئاگا [illegible] ئەویش:
پاراستنی نهێنی ژن و مێردایەتی یە ماڵی ژن و مێردایەتی زۆر زۆر بەرزوپیرۆزە بە هیچ شێوەیەک دروست نییە کە لەوپیرۆزی

- یە دابڕنرێت و لەکەدار بکرێت ...ڕوخساری
پیرۆزی ژن و مێردایەتی و حەیا دەبێت
پارێزراو بێت .. و ئەو ژن و مێردە دوو
پاسەوانی وریاو چاو کراوە بن بۆ ئەو
پاراستنە .

بۆ شانی هیچ کام لە ژن و مێردەکە
شایان نی‌یە کە ئەوەی ڕووی داوە لەکاری
ژن و میردایەتی و نهێنی‌یەکانی بەینیان
باسی بکەن بۆ خەڵکی ..

بە هیچ شێوەیەک ئیسلام ڕێ بە ئاشکرا
کردنی کاری ژن و مێردایەتی نادات کە دەبنە
هوی دابەزینی ئاستەکانیان .

ئەوەش کە نهێنی ئاشکرا دەکات بێگومان
لە لاوازی عەقڵ و ویژدان مردوویی و نزمێتی
خۆیەوەیە.. ئەم کارە بێ جێیەی کردووەو....
ئەم سوکایەتیەش کەس و کاری هەردوولاییی
زیان کردوو دەبن .

پێغەمبەری خوا - صلی‌اللەعلیه‌وسلم -
لەبارەی ئاشکرا کردنی ئەم نهێنیانەوە ...
دەفەرموێ :( **شرّ الناس منزلة عند الله
یوم القیامة الرجل یفضی الی المراة و
تفضی الیه ثم ینشر سرّها** ) .
**- رواه مسلم وابوداود.**

واتە : خراپترین و سەخت ترین شوێن و
جێگا لە ڕۆژی قیامەت دا خوای گەورە
بۆ ئەو پیاوەی داناوە کە دەچێت بەلا ی
ژنەکەیدا و سەرجێی لەگەڵدا دەکات و
دوای نهێنی ژن و مێردایەتیان بڵاودەکاتە
-وە ..

لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە لەکاتێک
دا کە لە خزمەتی پێغەمبەری خودابووە -
- صلی‌اللەعلیه‌وسلم - کە لە پیاوان ژنان
لەلای دانیشتبوون ... فەرمووی :
**(( لعل رجلا یقول ما فعل باهله
ولعل امراة تخبر بما فعلت مع زوجها ) ...
فارم القوم - ای سکتوا - فقلت ای والله
یا رسول الله انهم لیفعلون وانهن لیفعلن
قال : ( فلا تفعلوا فانما مثل ذلك مثل
شیطان لقی شیطانه فغشیها والناس
ینظرون ) - رواه احمد .**

مەبەست لەم فەرموودە ئەوەشییە
کە پیاوی وا هەیە باسی ئەو شتانەدەکات
کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا کردویەتی.هەروەها
ئافرەتیش هەیە لەگەڵ مێردەکەیدا کەشتی
کرد دەیگێڕێتەوە ... پێغەمبەر - صلی
اللەعلیه‌وسلم ... بە شتێکی نابەجێ و ...
خراپی لەقەڵەم داوە ....

**چەند تێبینی‌یەک هەیە لێرەدابخرێتە
پێش چاو باشە :**

(١) چاک وایە مێرد میانە ڕەو بێت لەکاری
جنسی ژن و مێردی دا.. و لە جێ بەجێ
کردنی ئارەزووی دا.. وە سنووری میانە
ڕەویش دووجا رە لە حەفتەیەکدا ئەتوانێ
زیادو کەمی بکات بەپێی پێویستی خۆی و
ژنەکەی بۆ خۆپاراستنیان لە حەرام..
بەڵام زیادە ڕەوی نەکات .. چونکە
دەبێتە هۆی زەرەر گەیاندن بە لەش و ....
داڕووخانی هۆش و بیرکردنەو ە ..

(٢) پێویستە ئەو کاتەی کە کاری سەرجێی
تێدا دەکرێت لەبارو گونجاو بێت.مەلە
کاتێک دا نەبێت کە ژنەکە نەخۆش بێت.
یان هیلاک بێت.. یان ئامادەیی تەواوی‌تیا
نەبێت... نەکو ببێتە هۆی پێ ناخۆش بون
و دەربڕینی ناڕەزایی... جا چاک وایە کە
هەریەکە لەو دوو هاوسەرە ڕعایەتی ئارەزوو
ئەوی تریان بکات .

(٣) سەرجێیی کردن دروستە لە هەموو....
مانگێک و کاتێک و ڕۆژێک و سەعاتێک و
لە ڕۆژابێت یاخود لەشەوا ...
بەڵام لە کاتێک دا نەبێت کە ئیسلام
حەرامی کردەوە تیایدا.. وەکو کاتی ڕۆژوو
گرتن یان کاتی بوونی خوێنی حەیزی ئافرەت
یان خوێنی منداڵ بوون یان کاتی ئیحرام
بۆ حەج و عەمرە .

(٤) لە ڕۆژو شەوی جومعەدا سوننەتە ...
کە ژن و مێرد سەرجێیی بکەن....

(٥) مێردەکە ئاگادار بێت کە عەزل نەکا
( واتە تۆوەکەی لە دەرەوەی ڕەحمی ئافرەتە
کەدا دا نەکات... مەگەر لەحاڵەتی زەروری
دا کە زۆر ناچار بێت.. ئەمەش دەبێت
ڕەزامەندی ژنەکەی لەسەر بێت.

# سەرەتایەك دەربارەی رەخنە

وەرگێرانی بەختیار

ئەگەر بۆ سەرەتای رەخنەی ئەدەبی بگەرێینەوە دەبێ ناوی یۆنانیەکان بێنین کە پێش میللەتانی دیکەی جیهان باسی رەخنەیان کردووە . هەنگاوی یەکەمی رەخنە لەوە دەستی پێ کردووە کە لەو سەردەمەدا کە شیعریك دەگوترا ، ئەوانەی دوای خۆی چەند وشەیەکیان لێ دەگۆری یان تیبینی‌یان لەسەر شیعرەکە دەردەبری ، لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زاییندا لە یۆنان شیعری شانۆیی هاتە کایەوە ، گرنگ نی‌یە ناوەرۆکی ئەم شیعرانە دەربارەی چی بوون . گرنگ ئەوەیە کە شیعرەکان لە لایەن چەند کەسێکەوە هەڵدەسەنگێنران ، هەروەها لەو سەردەمەدا پاداشتی یەکەم و دووەم و سێیەم پێشکەش دەکرا .

( ئەریستوفان ) کتێبێکی نوسی کە باسی جۆرەکانی شیعر دەکا ، شیعری کۆن و نوێ . وە لەو بروایەدا بوو کە زمانی شاعیر دەبێ بە شێوەیەکی وا بێ کە لە ئاستی تێگەیشتنی خەڵك بەرزتر بێ . وە هەر لەو کاتەدا دوو رێبازی ئەدەبی سەریان هەڵدا یەکیان گرنگی‌یان بە کەلەپور و بەرهەمی کۆن دەدا ، رێبازەکەی دیکەش ئەوە بوو کە رابردووی رەت دەکردەوە و گرنگی بە تازە کردنەوە دەدا .

( ئەرەستو ) تەکانێکی دیکەی بە رەخنەی شیعری دا و چەند کتێبێکی لەو بارەوە نوسی . لەو سەردەمەدا کۆمەڵی ( سوفستائیەکان ) دەرکەوتن ، کە گەنجەکانیان فێری رەوانبێژی دەکرد ، هەروەها ( ئەفلاتون ) چەند کتێبێکی نوسی کە باسی رەخنەی شیعر لەناو کومەڵگادا باس دەکا ، ( ئەفلاتون ) بیروراکانی بە شێوەی گفتوگو دارشت ( ئەفلاتون ) شوێنێکی لە ( ئەثینا ) تەرخان کرد بۆ بلاوکردنەوەی بیروراکانی ، بەلام ( سوقرات ) بە پێچەوانەوە هەروەك ( سوفستائیەکان ) هەر رۆژەی لە شوێنێك و جێگایەك بیروراکانی خۆی بۆ خەڵك باس دەکرد . شاعیر لە لای ( ئەفلاتون ) خاوەن بەهرەو ئیلهامە ، کەواتە شاعیر داهێنەر نی یە ، ئەوەی دەیلێ ئیلهامەو بۆی دێ ، هەروەها شیعر لە لای ئەفلاتون لە عەقلەوە سەرچاوە ناگرێ بەڵکو لە ئیلهام ، ئیلهامیش پەیوەندی بە عەقلەوە نی یە . وە شیعری بە هۆکارێك دەزانی بۆ لادانی گەنجەکان لەسەر رەوشت و خوی بەرز . هەروەها سی چوارچێوەی دارشت بۆ داهێنان و شیعر ، بە لای ( ئەفلاتون ) ەوە جیهانێك هەیە کە ئەویش جیهانی ئایدیایە . کە ئەمە بە لای ( ئەفلاتون ) ەوە سەرچاوەی هونەرە .

شاعیریش لاسایی ئەو جیهانە دەکاتەوە، کەواتە شیعر بنەڕەتی شتەکان نیە، بەڵکو سێبەری شتەکانە. بەلای (ئەفلاتون) ەوە کە دارتاشێك تەختەو مێزێك دروست دەکا، پێش ئەوەی دروستیان بکا لە مێشکیدا نەخشەی بۆ کێشاوە، کەواتە کورسییان مێزەکە سێبەری ئەو فکرەیە یەکەمجار بە مێشکی دارتاشەکەدا هاتووە. شاعیریش لاسایی وێنەی دووەم دەکاتەوە، بەم شێوەیە شیعر سێ پلە خوار ڕاستی یەوەیە. دوای ئەفلاتون (ئەرستو) کتیبێکی دەربارەی هونەری شیعر نوسی، شیعری کرد بە دوو بەشەوە بەشێکیان شیعری داستان و پالەوانێتی کە لەوەوە ترۆژیدی سەری هەڵداوە بەشی دووەم شیعری کۆمیدی. وە لە کتێبەکەیدا کە بەشێکی زۆری دەربارەی ترا‌ژیدیایە دەشێ بەشی کۆمیدیایەکەی لەناوچوبێ، وە هەروەها لەو کتێبەدا باسی جۆرەکانی شیعر کراوە جگە لە شیعری لیریکی کە ئەمەش دەشێ بۆیە ئەرەستو باسی نەکردبێ چونکە شیعری لیریکی لەو سەردەمەدا لە یۆنان پەیوەندی بە موسیقاوە هەبووە. شیعر لەلای (ئەرەستو) جۆرێکە لە لاساییکردنەوە. لێرەدا (ئەرەستو) لە بیروڕای (ئەفلاتون) نزیك دەبێتەوە.

ئەو بیروڕایەی (ئەرەستو) لەوەوە سەرچاوەی گرتبو کە بڕوای بە جیهانی هەست پێکراو هەبوو شیعر کەمتر لایەنی بەرجەستەی تێدایە، ڕاستە واقیع و وینگە لە بەرهەمە ئەدەبیەکاندا، بەرجەستە دەبێ بەلام خەیاڵ کە ڕەگەزێکی گرنگی شیعرە ناچێتە خانەی شتە هەست پێکراوەکانەوە، بۆیە شیعر بە لایەوە لاسایی کردنەوەیەو هیچی دیکە. وە لاسایی کردنەوەش لاساییکردنەوەی سروشتە.

شاعیران بە لای (ئەرەستو) باسی واقیعی خەڵك دەکەن یان بە واتایەکی دیکە وێنەی ژیانی خەڵك دەکێشن، جا یان لایەنە باشەکانی خەڵك دەردەخەن کە ئەمەش لە شیعری تراژیدی دا دەردەکەوێ یان لایەنە خەراپەکانی خەڵك دەردەخەن کە ئەمەش لە شیعری کۆمیدی دا دەردەکەوێ. وە ئەرەستۆ گرنگی بە تراژیادا وە تەنها لە بواری شانۆنامە لە بواری چیرۆك و داستاندا چونکە بەلای (ئەرەستو) وە تراژیدیاکانی خەڵك بەو شێوەیە هەست بە ئارامی یەکی دەرونی دەکا، کە (ئەرەستو) ئەو قۆناغەی ناو ناوە پاکژکردنەوەی دەروون.

کەواتە تراژیدیا دوو ئەرکی هەیە لەدوو ڕووەوە کار لە مرۆڤ دەکا یەکەمیان سۆز و خۆشەویستی مرۆڤ دەجوڵێنی و لە لایەکی دیکەوە ترس دەخاتە دڵەوە چونکە ڕووداوەکانی تراژیدیا کاریگەرن ئەو بیر و ڕایەی ئەرستو لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە هەندێك لە ڕەخنەگرەکان باسی دەکەن و دەڵێن: پاکژکردنەوە پەیوەندی بە ڕێ و ڕەسمە ئایینی یەکانەوە هەبووە لای یۆنانیەکان هەندێکی دیکەش لەو بڕوایەدا بوون کە مەبەست لە پاکژکردنەوە لای (ئەرەستو) بە تایبەتی و لە لای یۆنانیەکان بە گشتی پەیوەندی بەوەوە هەبووە کە شیعری تراژیدی بە لایانەوە هۆیەك بووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی لەسەر بنەڕەتی چارەسەرکردنی نەخۆشی هەر بەوجۆرە نەخۆشی یە وەك چارەسەرکردنی ترس بە ترس و خەفەت بە خەفەت. (ئەرەستو) بەو شێوەیە لەسەر تراژیدیا دەڕوا و دەیکا بە (سێ) بەشەوە کە لە چیرۆك و کەس و نەغمەی موسیقی پێك دێ وە دەبێ بابەتە تراژیدیەکە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی هەبێ تاکو

(ئەرەستۆ) جیاوازی کردووە لە نێوان دەقێك کە پێش ئەوەی لەسەر شانۆ پێشکەش بکرێ لەگەڵ دوای پێشکەش کردنی واتە خوێندنەوەی دەقەکەو کاریگەری خوێندنەوە جیاوازی هەیە لەو کاتەدا کە لەسەر شانۆ پێشکەش دەکرێ ئەمەش دەکەوێتە سەر دەرهێنەرو ئەکتەری لێهاتوو دەشێ دەقێك بە هۆی ئەکتەری لێهاتووەوە نرخ و بەهای زیاد بکا وە بە پێچەوانەوە هەروەها (ئەرەستۆ) باسی زمانی شیعریشی کردووە کە زمانێکی سەربەخۆیە و وشە و زاراوە و دەربڕینی خۆی هەیە رای وایە کە دە بێ زمانی شیعر زمانێکی سادەو ساکار بێ و خەڵك لێ ی تی بگا بەلام بۆ ئەمەش مەرجی داناوە کە نابێ وا بێت لە قسەی ئاسایی بچێ بەڵکو دەبێ رەمز و لێك چواندنو وەك یەکی بەپێی پێویست تێدا بێ .

جگە لە باسی شیعر (ئەرەستو) باسی بابەتێکی دیکەشی کردووە ، ئەویش باسی وتار بێژی ، لەو کتێبەیدا پێناسەی وتاربێژی کردووە ، دوایی باسی ئەو کەسانە دەکات کە گوێیان لە وتار دەبێ ، ئایا تا چ رادەیەك کاریان تێ دەکرێ ، دوایی دێتە سەر جۆرەکانی وتار ، وتاری سیاسی وتاری کومەلایەتی دوایی خاسیەتی هەر یەکێکیان باس دەکات هەروەها باسی ئەوە دەکات کە دەبێ ئەو کەسەی وتار بێژە دەبێ شارەزای دەرون و هەڵس و کەوت و جۆری بیرکردنەوەی ئەو کەسانە بێ کە قسەیان بۆ دەکات . دەڵێ (( تەنها ئەوەندە بەس نی یە بۆ وتاربێژ کە دەزانێ چ دەڵێ بەڵکو ئەوە گرنگە ئەوەی دەیزانێ دەبێ چۆنی بڵێ . هەروەها دەڵێ زمانی وتار هەندێ جار دەبێ سەرنج راکێش بێ و وشەکانی وەك وشەی شیعری هەست و سۆز بجولێنن ، بەڵکو وەك شیعر بێویستی

بە مۆسیقای وشە هەیە ، هەروەها (ئەرەستۆ) باسی جیاوازیەکانی شیعر و پەخشان دەکا . بیروراکانی (ئەرەستۆ) تا دوای خۆشی رەخنەگرەکانی شیعرکەلکیان لێ وەردەگرتن . تەنانەت (هۆراس) کە کتێبێکی دەربارەی شیعر نوسی زوربەی بیروراکانی لە (ئەرەستۆ) وەرگرتووە ، (هۆراس) دەڵێ مەبەست لە شیعر خۆشی بەخشین ، و کەڵك بەخشینە کە ئەم بیرورایە پێشدا (ئەرەستۆ) باسی کردووە . تەنها ئەوە نەبێ ئیلهامی خستوتە سەری و بیردوزەکەی پێ دارشتووە . عەرەبەکانیش چەندین کتێبیان دەرباری رەخنە لەو سەردەمەدا نوسی (جاحظ و ئامیدی و عبدالقاهر) چەندین کتێبیان دەربارەی رەخنە نوسی ، هەروەها باسکردن و تەفسیرکردنی قورئانیش یارمەتی دەرێك بوو بۆ ئەوەی عەرەبەکان زیاتر لە بەلاغەو وشەسازی و لێك چواندن و رەمزدا شارەزا بن . چونکە قورئانی پیرۆز جگە لەوەی کە بەرنامەی ژیانیان بوو سەرچاوەی ئەدەب و فەرهەنگیش بوو . لە دوای (ئەرەستۆ) لە ئەوروپا بە ماوەی چەند سەدەیەك شورشی پیشەسازی دەستی پێکرد و ئەوروپا پێی نایە قوناغێکی دیکەوە ، بێگومان ئەدەب و شیعریش لەگەڵ گۆرانکاریەکانی ژیاندا ، گۆرانی بەسەر دا دێ و بەرگی نوێ لەبەر دەکا .

لەو سەردەمەدا کە ئەوروپا گەیشتە قوناغی تەکنەلۆژی و شۆرشی پیشەسازی سەری هەڵدا ، بیرورای جۆراو جۆر دەربارەی ئەدەب و شیعر هاتنە کایەوە ، لەو کاتەدا رەخنەیان لە یۆنانیەکان دەگرت و بیروراکانی (ئەرەستۆ) یان وا لێك دەدایەوە کە لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە زانستی یەدا ناگونجێن . هەروەها لە سەردەمی هەژدەهەمدا لە ئەوروپا دوو

ڕێبازی ئەدەبی سەریان هەلدا کە یەکێکیان دەیگوت دەبێ بگەرێنەوە بۆ رابردوو بۆ بیروڕایەکانی ( ئەرەستۆ ) و ( ئەفلاتون ) ڕێبازەکەی دیکەش لەو بروایە دا بوو کە هەر سەردەمەو بیروڕای خۆی هەیە . وە لە بەریتانیا " توماس جرای " سەرەتا و بنە ماکانی ئەدەبی رومانسی دارشت کە گرنگی بە سروشت و جوانی سروشتی دەدا . هەر لەو سەردەمەدا چەندین نوسەر دەربارەی ئەدەب و شیعر بەرهەمیان پێشکەش کرد ، نوسەرێك کە ناوی " لاوکون " بوو بابەتێکی رەخنەیی پێشکەش کرد کە بەراوردی شیعرو هونەری وێنەکێشانی کرد . هەر لەو سەردەمەدا " وردزورث " ی ئینگلیزی لە پێشەکی دیوانی شیعری یەکەی دا ئەوەی دەرخست کە دەبێ شیعر بۆ زوربەی خەلك بنوسرێ و ئەو رایەی رەت کردەوە کە دەلێ شیعر زمانێکی تایبەتی هەیە ، وە دوای ئەویش " کولردج ) ی هاورێی هەمان بیروڕای هەبووە ، وە لەو بروایەدابوو کە لە شیعردا کێشی و سەروا گرنگ نی یە بەلکو ئەوەی گرنگە خەیال و ئیقاعی وشەیە . هەروەها " مدام دی ستایل ." لە ئەلمانیا کتێبێکی نوسی کە باسی پەیوەندی ئەدەب و هونەر بە کۆمەلگاوە دەکا و دەری خست کە شیعر و ئەدەب دەبێ باری کومەلگا دەربرن . پێشکەوتنی زانست و پیشەسازی کارێکی وایان کرد کە داوایان لە نوسەر و شاعیران دەکرد کە گرنگی بە زانست بدەن و دەیان گوت دەبێ زانست و لێکولینەوە زانستی یەکان لە مەیدانی ئەدەب و شیعریشدا کاری خۆیان بکەن . دەیانگوت چۆن زانایەکی روەك ناسی یاساکانی بەسەر روەکدا جێ بە جێ دەکا و خەسلەت و تایبەتیەکانی روەك ناسی باس دەکا . دەبێ شیعر و ئەدەبیش هەمان کار ئەنجام بدەن . بۆ نمونە ئەوان دەیانگوت دەبێ یاساکانی ئەدەب وەك یاسا زانستی یەکان گشتی بن ئاو کە لە ئوکسجین و هایدرۆجین پێك هاتووە ، ئەم یاسایەیان لە سەر ئەدەب جێ بە جێ دەکرد . لەو بروایەدابوون کە ئەدەبیش بە هەمان شێوە ئەدەب لە هەموو شوێنێك دەبێ یەك یاسای هەبێ ، بەو مانایە ئەدەب دیاردەیەکی تایبەتی نی یە بە شوێن و جێگایەکەوە ، بەلکو ئەدەب یاسایەکی گشتی هەیە . هەروەها ڕێبازی بەرناسی و رەمزی سەریان هەلدا کە ڕێبازی بەرناسی دژ بە شیعری رومانسی و خەیال و سۆز وەستا و داستان و بەرهەمی رابردوویان کردە کەرەستەی بەرهەمەکانیان ، هەروەها ئەدەبی رەمزیش لەو کاتەدا برەوی پەیدا کرد . ئەوان لەو بیرو رایەدابوون کە شیعر ئەو شتانە دەردەبڕێ کە ئێمە ناتوانین دەریان ببرین ئەمەش پێویستی بە رەمز هەیە بۆ ئەوەی ئەو شیعرە دەربڕێت . هەروەها لە سەدەی بیستەمیشدا چەندین ڕێبازکەی ئەدەبی سەریان هەلدا کە هەر یەکەیان ئامانج و مەبەستیان لەوەی دیکە جیا بوو ، هەر یەك لە " فرۆید و کارل یونگ " بیروڕای تایبەتی خۆیان دەربارەی ئەدەب دارشت . بێ گومان ئەو بیروڕایانە لە هەلەو کەم و کوری بی بەش نەبوون . فرۆید لای وا بو کە کاری داهێنان بریتی یە لەو ئارەزوە جەستەیی یانەی مرۆڤ کە مرۆڤ لە قۆناغی مندالێتی دا نەیتوانیوە تێریان بکا ، جا ئەم هەست و سۆز و ئارەزوە لە نەست واتە لە (لاشعور)ی ئەو کەسەدا ماونەتەوە . واتەکاری هونەری جێبەجێ کردنی ئەو ئارەزوانەیە کە مرۆڤ نەیتوانیوە تێریان بکات .

ئەوانە کاری ئەدەبی و هونەری یان لە روانگەی سایکولوژی یەوە هەلدەسەنگاند . باشی و خراپی شیعر لە لای ئەوانە بەوەدا نەدەناسرا کە لایەنی هونەری و جوانی و وشە سازی بەهێز بێ ، واتە لایەنە مادیەکان

گرنگی‌یان نەبوو بەلکو ئەوەی گرنگ بوو بە لای ئەوانەوە لایەنی دەرونی بوو . ئەدەب بە لای ئەوانەوە چەمکێکی فراوانی هەبوو کە تەنها بریتی بێ لە رەوشت و خوو باسی باری کۆمەلایەتی بەلکو سەرچاوەکەی دەرونی مرۆڤە . هەر لە سەردەمی ( بوجبارتن )ەوە بیروڕای ئەدەب و گرنگی دان بە لایەنی جوانکاری سەریان هەلدا . چەندین پرسیار سەریان هەلدا لەوانە ئایا جوانی خودی یە یان بابەتی ؟ فەلسەفە باڵی بەسەر ئەدەبدا کێشاو ئەدەب و لایەنی جوانکاری مەودایەکی فراوانی لە فەلسەفە داگیر کرد .

( کروتشە ) یەکێك بوو لەو فەلەسوفانەی کە پێی وابوو دەربرین هونەرە و کاری هونەری وەك بونەوەریکی ئەندامی وایە ویانی ئەندامی شێوەو ناوەرۆکی نی یە کەواتە نابێ لە ئەدەب و هونەریشدا شێوەو ناوەرۆك لێك جیا بێ . بەم شێوەیە ئەم بیروڕا فەلسەفی یە تێکەلی ئەدەب و هونەر بوو ئەوانە دەیان گوت بونەوەرە ئەندامی یەکان لەیەکەیەکی پەیوەندی دار دان کە هەموویان پەیوەندی یان بە یەکەوە هەیە کاری ئەدەبیش بە هەمان شێوە پەیوەندی یەکی لێك نەپچراویان بە یەکەوە هەیە ئەوەی لێرەدا بۆمان رون بووە کە لەم چاخەدا چەندین ڕێبازی هونەری و ئەدەبی سەریان هەلدا ئەو بیروڕایانە زوربەیان ڕەگیان دەچێتەوە سەر بیروڕاکانی ( ئەرەستۆ و سوقرات و ئەفلاتون ) لەگەل چەند جیاوازی یەکدا هەندێکیان لەو بڕوایە دابوون کاری هونەری پەیوەندی بە بارودۆخ و کۆمەلگاوە نی یە واتە ئەرکی هونەر ئەرکێکی کۆمەلایەتی نی یە وەك ڕێبازی هونەر بۆ هونەر کە لە فەرەنسادا سەری هەلدا ئەدەب و هونەریان لە ئەرکە کومەلایەتی یەکەی جیاکردەوە . عەقلی مرۆڤیان کرد بە سێ بەشەوە بەشی یەکەم : هێزی بیرکردنەوەیە کە وا لە مرۆڤ دەکا بەرەو حەقیقەت و ڕاستی-یەکان بچێ دووەم : هێزی ئیرادەیە ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ بەرەو کاری چاکە دەبا سێیەم : هێزی هەست و سۆزە کە ئەمەیان پەیوەندی بە لایەنی جوانکاری هونەری یەوە هەیە . بەم شێوەیە شیعر و ڕەوشت و خو و یاسا و نەریتی کۆمەلایەتی یان لە یەکتر جیا کردەوە چونکە بە لای ئەوانەوە ئەدەب و هونەر جوانی دەبەخشی جوانیش سەربەخۆیە و لە چالاکی و کارەکانی دیکەی مرۆڤ جیایە بیروڕایەکی دیکەش کە هەر لەو سەردەمەدا سەری هەلدا ئەوە بوو کە شیعر و ئەدەب و کاری هونەری بەو ڕووداو یادکارانەوە گرێ دەدا کە لە ڕابردوودا کاریان لەو کەسە کردووە و دوایی لە گەورەییدا بە شێوەی هونەر و ئەدەب سەریان هەلداوە ، ( فروید ) لەو بڕوایەدا بوو کە کاری هونەری چەند غەریزە و ئارەزوویەکی تێرنەکراوی سەردەمی مندالی مرۆڤن و لە نەست ( لاشعور ) ی ئەو کەسەدا پاڵێزراون لەبەر بارودۆخی کۆمەلگا نەیتوانیوە ئەو ئارەزووانە بێنێتە دی تەنانەت ( فرۆید ) هەر لەو ڕوانگەیەوە خەونیشی لێك دایەوە .

دوای ( فرۆید ) ( کارل یونك ) نەستی لە تاکەوە گواستەوە بو کۆمەل ، واتە ئەو یاسا و نەریت و داستانە فولکلوریانەی کە گەلان لە ڕابردوودا پێشکەشیان کردوون لە نەستی کۆمەلدا ماونەتەوە ( کارل یونگ ) دەلێ : زۆرجار کە مرۆڤ گوێ لە پارچە موسیقایەك دەبێ کاتێ پارچە موسیقاکە کۆتایی دێ بەلام ئەو کەسە هەر هەستی پێ دەکا . ( کارل یونگ ) ئەمە چۆن لێك دەداتەوە ؟

کوێ گرتنەکە پەیوەندی بە هۆش ( الوعی ) ئەو کەسەوە هەبووە لە ویوە گوازراوەتەوە بۆ نەست ( لا وعی ) ئەو کەسە کاتێ کۆتایی پێ هاتووە لە نەستەوە گوازراوەتەوە بۆ هەست ئەدەب و هونەر لای ( کارل یونگ ) پەیوەندی- یان بە جیهانی نەستەوە هەیە بیروراکانی لە ( فروید ) ەوە نزیکن دەبێ ئەوە بزانین کە باسکردن دەربارەی رەخنەی ئەدەبی گرانە چونکە ئەدەب و هونەر یاسایەکی چەسپاویان نی یە و زیاتر پەیوەندی یان بە لایەنی ئیستاتیکی یەوە هەیە . یاسای ئەدەب یاسایەکی کیمیای نی یە بۆ نموونەزانایەکی کیمیای لە شوێنێك تاقی کردنەوەیەك دەکا دەشێ لە شوێنێکی دیکەش هەمان تاقی کردنەوە بکا دەشێ یەك ئەنجامیان هەبێ بۆیە پێویستە رەخنەگریش رەچاوی یاساکانی ئەدەب و هونەر بکا و لە کاتی توێژینەوە لەسەر دەقێك بیروڕای کەسایەتی نەچەسپێنێ و دۆستایەتی نەکاتە دادوەر بەڵکو بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لێ ی بدوێ نەك دەقێکی ئاست نزم بە ئارەزووی خۆی بەرز بکاتەوە و دەقێکی بەرزیش بە ئارەزووی خۆی دابەزێنێ ، ئەگەر کەسێك لەسەر شاعیرێکی وەك گۆران بدوێ دەبێ بەبێ گوێ دانە بیروباوەری ( گۆران ) دان بەوە دابنێ کە (گۆران) توانیویەتی وێنەکێشێکی سەرکەوتووی واقیع و سروشت بێ .

## ڕۆژنامەی کوردستان




**ڕۆژنامەی کوردستان گەیشتە دەست خوێنەران**

ڕۆژنامەی کوردستان لە بەشی ڕاگەیاندنی نەرویج بە عەرەبی دەردەچێت ، گەیشتە خوێنەرانی لە هەندەران چەند ژمارەیەکیشی بە دیاری گەیشتە دەستمان ، شایانی گوتنە لە دوا ژمارەدا ئەم بابەتانەی تێدا بلاوکراوەتەوە :-

- لە نێوان ڕەسانەیەتی و نامۆیی دا .
- کوردستانی عێراق لە شەری سەنگەرەوە بۆ شەری ڕێك کەوتن نامەکان .
- کۆمەڵێ هەواڵ دەربارەی :- هەولێر و شەری کەسنەزان - هاتنی وەفدی ئەمریکی بۆ کوردستان - هەوڵدانی مۆسکو بۆ کوکردنەوەی صەددام لەگەڵ کوردان لەسەر مێزی دانیشتن .
- هەوڵی ئاشتی خوازانە لە کوردستان دا .
- لە لاپەرەی سێیەم دا بابەتێك بە ناوی لێکۆڵینەوەیەك لەسەر باری کۆمەلایەتی .
- ئایا گۆرانی حەماس بۆ حیزبێکی سیاسی لە تەوژمی سەری کەم دەکاتەوە ؟
- لە دوا لاپەرەش دا ئەم بابەتانە دەخوێنێتەوە : - چۆن لە ئیسلام بکەین و چۆنیش ڕاگەیاندن دەربارەی بکەین - نهێنی کوردان لە ئەرشیفی هیندی یەکان دا - لە هەموو پەریزێك گوڵە گەنمێك - باسی ئەو نەدوەو کۆبونەوانەی ڕاگەیاندنی بەشی نەرویج ئەنجامی داوە لەگەڵ گەلێ باسی تر .

# چیرۆکی منداڵان

# دەرس وتنەوە

ژیان هەورامی

سەرەتای ساڵی خوێندن بوو... قوتابیەکانی ناو گۆڕەپانی قوتابخانەکە .. کردبوویان بە ڕۆژی خۆیـان منالان ڕاکردن و تەراتێنێکیان بوو... قیژوو وڕیـان بوو

دەورو بەری قوتابخانەکەیان هەراسان دەکرد

مامۆستای چاودێر تا دوانی بانگ دەکرد و بێ دەنگی دەکردن... سیانی تر لەبەردمیا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە شکاتیان لە .... منالە هاوڕێ عەجولەکانیان دەکـرد ...

لە ناو قوتابی یەکاندا... جۆرەهـا جلی جوان و ڕەنگاو ڕەنگ دەبینران .کـە لەبەریاندابوو.... جورەهـا منداڵی هـەژارو بێ دەرەتانیش بە جل و بەرگ و دەم وچاو- -یاندا جیـا دەکرانەوە...

لەبەر حانووتی( فرۆشگای) نـاو قوتابخانەکەدا.. منالان.بەریـز وەستابوون بۆ خەرج کردنی ڕۆژانەکانیـا ن چەند منداڵێکی عەجوولی شەڕانیش بەئاشکرا ڕیزەکانیان بە پاڵ نان و خۆ بردنە پێشـەوە دەشێواند... زۆر زۆریشیان لەدەوری ئەو حانوتەدا... بەبێ پارە دەخولانەوەو لەبـەر نەبوونی نانی بەیانیشیان نەخواردبـوو...

ئاااخ تا سەرنجیان بدەیت و لێیا ن ورد بیتەوە زیـاتر خەفەت و ژان خۆیان.... دەکەن بەناو پەرەکانی دڵت دا....

ساڵێکەی ئەهاتییە هەژاری و برسێتی یەخەی ماموستایانیشی گرتووەو تەواو بێزارو نارەحەت بوون .. ئەگەر لە بەر قوتابیان.. نەبوایەو لایەنی مرۆڤایەتییان لێک نەدایەوە ئەوا بەیانیان لە جیاتی هاتنیان بۆ قوتابخانە دەچوون بۆ ناو بازار تا کاسبی یەک بکەن و لەوە زیاتر تەحەمولی برسێتی و هەژاری و قەرزاریان نەمابوو...

خۆ دەیەهای وەکو مامۆستا هێمن کە ماموستای ناوەندیش بوو دەرسی جوغرافیای دەوتەوە.. بەڵام لەبەر هەژاری مۆڵەتی ساڵێکی وەرگرت بوو تا کاسبی یەک بکات ... دەزانی چ کاسبی یەک ئەبێ ملمۆستای سانەوی..لـــە پاش دەرچووی لە زانکۆ و پانزە ساڵ خزمەت دەبێ چ کاسبیەک بکات ... ؟!!

با ئەم پرسیارە لە منداڵەکانی نـاو گۆڕەپانی قو تابخانەکە بکەین .. خو هـەر کامیان بانگ کەی دەیناسێ و دەیزانێ....... چون نای ناسن... منالانی تریش دەیناسـن .... ژنانیش دەزانن مامۆستا هێمن خەریکی چ کاسبی یەکە.... هەتا بەیانی یەک پێـش خۆر هـەلاتن باجی ئامینی نان کەر جنێویشی پێ دابوو... کەی ئازانی لەسەر چی... لەسەر ئەوەی کە بەیانیان زۆر زوو بە عەرەبانە شکاوەکەیەوە تەقتەق بـە کوڵانەکاندا دەگەڕێت و هاواری پاقلەی کولاو دەکات و باجی ئامینی نان کەر خەوی لـێ زرابوو... !!!

ئەمە کاری ماموستا هیمنە... کەچی.. روژیک دوو ماموستا باسیان دەکرد ....... یەکیکیان وتی خوزگەم بە خوی بەس نییـە ئەو لەروشی دی خو من رووی ئەو جورە.... کاسبیانەشم پێوە نییە.

ئەمە ئەوە نییە ماموستاکانی نـاو قوتابخانەش بە پیاو و ئافرەتیانەوە بە پی خەفەریات هە یەکە یان روژیک حانوت...

دەبا بەریوە کونجی و مەسکەپت دینێتە ناو
کورەپانی قوتابخانەکەو منالان دەورەی لێ
دەدەن و شتی لێ دەکرن... دەوەرە ماموستای
هەژار سامت بمێنێ لای قوتابی و لە پولدا
شەرمت لی بکەن...

چی بکەن ئەم ماموستا هەژارانەش لەبەر
تازانجەکەی وا دەکەن تا یەکی پارەی یەک
کیلۆ ئاردیان دەست کەوێت...

قوتابی و ماموستا .. یەک لەیەک ...
ماندوو ترن..

ماموستا ئارام پێ کەلەم قوتابخانەیە
دا دەرس دەلێتەوە ... لەپاش دەوام دەچێتە
لای ئەو تەختەیەی کە لەبەر بەلەدیکەدا....
دەرزی و دەزوو شانەو ئاوێنەو وردەشتی
لەسەر داناوە.ڕوژ تا ئێوارە لە قوتابخانە
بە هۆی وانە وتنەوەوە پەدەنگی بەرز دەرس
دەلێتەوەو قیژەی مندالان... دوای دەوامیش
تا ئێوارە لەبەر بەلەدیکە ناوی شتەکانی
دەبات تا خەلکی لێی بکرن.. ئەوە ماوەی
- کیشە کچە بچکولەی نەخۆشەو شەو تا بە
بەیانی لەتاو ئازاری کوێچکەی ئەگری.......

ماموستا خەویشی لێ تێک چووە ئای
کە ماموستا .. لەم روژەدا غەدری لێ دەکرێ
تەنانەت لەلایەنی هەندی دایکان و باوکانی
قوتابیشەوە... دلیان ئازار دەدرێت.. بەلام
لای زۆربەی زۆری خەلکی ماموستا هەر
ڕیزو نرخەکەی خۆی هەیەو هەر پێشەوای
خەلکە...

قوتابیانیش ئێستە دەبێ زیاد لەڕادە
گوێ رایەلی ماموستاکانیان بکەن و ڕیزی
خویانیان بدەنی و وانەکانیان باشتر ئامادە
بکەن... زەنگی چوونە ژوورەوە لێی داو
قوتابیان بەرەو پولەکانیان ڕویشتن ......
یەکەیەکەو دوو دوو ماموستاکانیش بەدوای
یەکدا لەژووری ماموستایان هاتنە دەرەوەو
ڕێی پولەکانیان گرتەبەر....
بێدەنگی بالی کێشا بەسەر پولەکانداو...
لە پولەکانەوە دەنگی دەستانی چاودێر....
دەبیسترا و بەیانی باشی ماموستا شەپولی
ژیانت باشی توتابیانی ئەدا بە گوێی ...
بیستەراندا.......

لەپولەکانەوە دەنگی دەرس وتنەوە...
دەستی پێکرد .......

# قورئان و هەتیو

سەردار ڕەزا

**(( قورئان و هەتیو ))**

**( فَامّا الیَتیمَ فَلا تَقهَرْ )**

کام ڕێبازە.. کام بەرنامە
کام ڕاپۆرتە... کامە نامە
کام نوسراوە... کام ڕۆمانە
کە بۆ هەتیو .. وەک قورئانە
قورئان وەک باوک و برایە
بەلکو سۆزی زیاتر لایە
قورئان ..... پۆشەوکار چرایە
قورئان.. ماف و سۆزی تیایە
قورئان وەکو تیشکی خۆرە
سپی دەکات... کام دل بۆرە
بۆ هەتیوان....... پاریزەرە
باخاتێکە... پڕ سێبەرە
پالپشتێکە ...... بێ هاو وێنە
دەفەرموو ..... باش باش بیخوێنە
بیست و سێ جار لە قورئانا
بانگی ئەدا بەجیهانا
داوای مافی هەتیودەکا
ئالای بەرگری هەل دەکا
دەی کەواتە... ئەی هەتیوان
بۆ پالپشت... وەرنە لای قورئان
دەست نوێژ بگرن با بیخوێنین
پەروەردەی جوانی دەربێنین
بەکردەوە...... کاری پێ کەین
لەسەر ڕێبازەکەی ڕێ کەین

# معرفة الرجال
## من سمات القيادة الناجحة

سامي سلمان

إن من مسلمّات الإدارة الناجحة القدرة على الاستفادة من مكامن التفوق، والتميز لدى المرؤوسين بأفضل ما يمكن، ولكي يتحقق هذا كان لزاماً على القادة والرؤساء ضرورة معرفة وتمييز هذه المكامن لدى مرؤوسيهم، وهو ما نعنيه بمعرفة الرجال.

إن توفر الرجال (أولاً)، والقدرة على توظيفهم لخدمة أهداف رسمها لهم القادة (ثانياً)، لهما طرفا المعادلة الإدارية التي ينتج عنها نجاح القادة، وكلما أحسن القادة الاستفادة من هذا التوظيف كلما نتج عنه تفوق ونجاح. ومن هنا اعتبرت القيادة فناً صعباً لارتباطها بالعنصر البشري الذي يصعب تحليله وفهمه ببساطة كما هو الحال في العناصر الكيميائية الطبيعية. ومن خلال هذا التصور يمكننا فهم صورة العلاقة بين نجاح القادة، وبين قدرتهم على معرفة الرجال. وينبغي ألا ننسى أن نجاح القادة ينتج عنه تحقيق لأهدافهم في الواقع.

كتبت إحدى أكبر المنظمات العالمية هذه الكلمات لتعبر عن سر نجاحها وتفوقها:

« لقد حققنا هذا النجاح من خلال تنظيم إداري وجو عمل يساعدان على اجتذاب أفضل الكوادر البشرية، وتطوير وشحذ المواهب الفردية..».

ونلحظ في هذه الكلمات عنصرين أساسين:

العنصر الأول: اجتذاب أفضل الكوادر البشرية.

العنصر الثاني: تطوير وشحذ المواهب الفردية.

ولا شك أنه ليس من الممكن تحقيق هذين العنصرين دون القدرة على معرفة الرجال.

ثبت عن رسول الله ﷺ أنه قال: «أرأف أمتي بأمتي أبو بكر، وأشدهم في دين الله عمر، وأصدقهم حياءً عثمان، وأقضاهم علي، وأفرضهم زيد بن ثابت، وأقرؤهم أُبي، وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل، ألا وإن لكل أمة أميناً وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح »(١).

إن من أسرار العظمة التي تمتع بها رسول الله ﷺ قدرته على معرفة رجاله، وحسن توظيفه لهم، كلاً حسب قدرته ومواهبه، يقول أحد المفكرين: « إن معرفة الرجال بعمق من أدق أعمال الرئيس وأكثرها تأثيراً، إنها ينبوع القوة التي يملكها، إنها سر الرؤساء العظام »(٢).

ومن المفيد هنا أن نحلل عظم الفائدة التي يجنيها القائد المتمكن من معرفة الرجال.

- أولاً: إن معرفة الرجال هي الطريق الأمثل لحسن توظيفهم ووضعهم في المكان الذي يمكنهم أن يقدموا أفضل ما يكون في أنفسهم لخدمة أهدافهم.
- ثانياً: إن توظيف المرؤوسين في مكانهم المناسب هو الحافز الحقيقي لإيجاد روح الاستمرارية والعطاء للأفراد، حيث يحقق الأفراد ذواتهم بتميّزهم وتفوقهم من خلال إمكاناتهم الحقيقية.
- ثالثاً: إن القدرة على الارتقاء والإبداع لمن وضعوا في المكان المناسب نتيجة إمكاناتهم هو ما أثبته الواقع والتجارب الحية، مما ينعكس على تمييز التنظيم الذي يسير خلف القائد الناجح.

- رابعاً: إن الإرباك وقلة الخبرة التي يظهرها أولئك الذين لم يتمكن المسؤولون من حسن توظيفهم لقلة معرفتهم بحقيقتهم، هي إحدى السلبيات التي يمكن القائد الناجح تفاديها نتيجة معرفته برجاله.
- خامساً: إن سد الثغرات بالمرؤوسين الأكفاء الذين أحسن القائد انتقاءهم يمكنه من التفرغ والمراقبة عن كثب لمن هم بحاجة إلى توجيه، وبهذا يستطيع من خلال معرفته للرجال سد الثغرات، والارتقاء بالآخرين دون عناء.
- سادساً: إن درجة سيطرة القائد والرئيس على رجاله عملية مرتبطة ارتباطاً وثيقاً بمدى تفهمه لشخصياتهم، ونفسياتهم، وقدراتهم، ولذلك فهو لا يستطيع أن يقدر حجم المهام أو مستوى التكليف أو حدود الاستطاعة التي إذا تجاوزها تعرض الانضباط للمخالفة دون أن يتمكن من معرفتهم حق المعرفة.
- سابعاً: إن الاستعداد الذي يبديه المرؤوسون بالتعايش وبث الآلام وطلب المساعدة لأولئك الرؤساء الذين استطاعوا فهمهم ومعرفتهم لهو أكبر بكثير مما يبديه من لم يستطع رؤساؤهم تخمين ما يدور في رؤوس من يقودونهم

ومن هنا يستطيع القادة احتواء غيرهم بمعرفة أسرارهم، وآلامهم، والعمل على القيام بدور الموجه والناصح لهم، بعد أن امتلكوا قلوب مرؤوسيهم.

ولنقف وقفة مع هذا النص من واقع الخليفة الثاني: «كان الخليفة عمر بن الخطاب، رضي الله عنه، يشاور أفاضل الرجال في تعيين كبار موظفيه، فقال لهم يوماً: أشيروا علي ودلوني على رجل استعمله في أمر قد دهمني، فقولوا ما عندكم، فإنني أريد رجلاً إذا كان في القوم وليس أميرهم كان كأنه أميرهم وإذا كان فيهم وهو أميرهم كان كأنه واحد منهم، فقالوا: نرى لهذه الصفة الربيع ابن زياد الحارثي، فأحضره وولاه. فوفق في عمله وقام فيه بما أربى على رجاء عمر وزاد عليه، فشكر عمر لمن أشاروا عليه بولاية الربيع»[1].

والناظر في هذا النص من خلال ما سبق وقدمناه من أهمية معرفة الرجال يلمس الجوانب التالية:

١- فهم عمر رضي الله عنه لأهمية اختيار الرجال ومعرفتهم وذلك من خلال تشاوره مع أفاضل الرجال في تعيين كبار موظفيه.

٢- حرصه ـ رضي الله عنه ـ على وضع الرجل المناسب في المكان المناسب فقد بين لمن استشارهم صفات الرجل الذي يريد، حتى يتمكنوا من اختيار من يوافق هذه الصفات ليحقق هدف عمر.

٣- حكمته ـ رضي الله عنه ـ في معرفة الرجال من خلال مواقفهم وتصرفاتهم، لا من خلال أقوالهم وما يقال عنهم، فقد استطاع أن يجسد في نظر مستشاريه مثال الرجل الحي الذي يريده.

و أخيراً بهذه المعاني المتقدمة تستطيع أن تفهم سر المواقف التالية:

١- يحكم على المرؤوسين بالذكاء والإنتاجية في مكان ما ثم يكتشف بأن لديه طاقات كامنة من رئيس جديد.

٢- يصف أحد الرؤوساء مرؤوساً بأنه جيد ويصفه الآخر بأنه سيء.

٣- يهمل المرؤوس لأنه لا يصلح لشيء البتة، ثم يكتشف بأن لديه طاقات كامنة من رئيس جديد.

٤- يبذل المرؤوس ويعطي عطاءً أفضل عند رئيسه الجديد أكثر مما كان يفعل مع رئيسه القديم.

وليس هناك من تبرير جيد إلا أن أحدهم أحسن القيادة بمعرفته مرؤوسيه والآخر فشل في ذلك.

ملاحظة :- تكملةً واشباعاً لهذا الموضوع نرجو من قرائنا الاعزاء أن يتأملوا دعاء سيدنا عمر وأن يعتبروا لأن في ذلك لعبرةً لأولي الأبصار

**يُروى** عن أمير المؤمنين عمر بن الخطاب رضي الله عنه أنه قال: «اللهم إني أشكو إليك جلَدَ الفاجر وضعف التقي». فإذا كان أمير المؤمنين في زمنه قد شكا من هذا الأمر فماذا نقول نحن أبناء هذا العصر؟!

لقد كان حرص الخليفة شديداً في اختيار الرجال وفي تمحيص أصحاب الكفاءات، ليطبق شرع الله كاملاً، ويحوله إلى واقع عملي ملموس على أيدي أصحابه وقد تحقق له ذلك بفضل الله تعالى.

هذه المقولة تصور لنا صنفين من الناس:

- جَلَد الفاجر وصبره ودأبه، وتعاونه مع أمثاله لتحقيق ما تصبو إليه نفوسهم من أهداف.
- وطيبة قلب التقي وحسن الظن لديه زيادة عن الحد المطلوب ثم التواكل وعدم التعاون مع أمثاله في أغلب الحالات.

وها نحن في هذا العصر نرى قوة أهل الباطل وتعاونهم بينما نجد أن أهل الخير والصلاح متباعدين، لا يأخذ التعاون من أنفسهم اهتماماً جاداً وإذا بدأوا مثلاً بمشروع خيري أو مؤسسة طيبة الأهداف، فقلما يستمرون فيها، بل ربما آلت إلى بعض الأفراد من الصنف الأول بسبب جَلَد هذا الصنف وإتقانه أسلوب التلون مستغلاً حسن الظن أو التقاعس عند الناس الطيبين.

ومنذ مطلع هذا القرن الميلادي، نلاحظ أن أعداء الإسلام قد خططوا لحربنا، ونجحوا في تحقيق كثير من أهدافهم مع الأسف. فالنصارى مثلاً دأبوا على تنصير أبناء المسلمين مستغلين الفقر والجهل والمرض باذلين الأموال في سبيل هذا الغرض. وإذا لم ينجحوا في تحويل أبناء المسلمين إلى النصرانية فقد شككوهم في صلاحية دينهم وهيمنته على حياتهم.. وإذا سألت عن أموال المسلمين، فربما وجدتها تصب في مصالح أعدائهم قصداً أو دون قصد.

وكان أهل الباطل قد جندوا قواهم في مطلع هذا القرن كذلك باسم القومية، ورفعوا شعارات منها: أن الدين لله والوطن للجميع، وأن الأديان يجب ألا تفرق بين أبناء الوطن الواحد..

إن داء الغفلة، وداء التواكل، والتسويف المميت، من أشد أمراض المسلمين مع الأسف في هذه الأيام رغم أن ديننا هو دين العزة والقوة والمنعة إذا تحول إلى واقع حي في نفوس أتباعه، إذ لا بد أن يتفاعل المسلم مع أحداث أمته تفاعلاً إيجابياً، أن يتأثر ويؤثر من أجل تغيير هذا الواقع المرير.. والمسلم قوي بأخيه، والتعاون على البر والتقوى من أهم مبادىء ديننا.

# زمان الفاتحين

أسدل ستارك يا زمن الفاتحين

أسدل ستارك ايها التاريخ وضاء الجبين

أسدل ستارك إننا

ما بين غمّ وانهزام

لا سعد يعيش الطغام ولا صلاح الدين

لا القادسية شمسها انشقت ولا حطين

أسدل ستارك يا زمن الفاتحين

في ظل هذا الانقسام

في ظل قانون النظام

وظل مأدبة اللئام

وفي ظل تحوير الجهاد الى سلام

والاحتكام لغير رب الأحكام

صرنا كقطعان الغنام

أسدل ستارك يا زمان الفاتحين

وقل على العرب السلام

من للجهاد اذا أهين الواعظون

وتربصت بهم المنون

وتشبعت بدمائهم غرف السجون

ورأيت اعداء العقيدة يسرحون ويمرحون

من كل فج ينسلون

وعلى دماء شعوبنا يتآمرون

من للجهاد ...

يا أمتي من للجهاد ؟

أسدل ستارك يا زمان الفاتحين

أسدل ستارك وانتظر

أسدل ستارك واصطبر

فلرب قلب ينفطر

ولرب قلب يستعر

ولربما في عصرنا

يأتي الزمان المنتظر

ولربما من صلبنا

تأتي صناديد البشر

ولربما من قهرنا

تأتي فلول الفاتحين

ولربما من ذلنا

يأتي إباء الأولين

ولربما من بيننا

يأتي أمير المؤمنين

يأتي عمر

يأتي الظفر

يأتي صلاح الدين

محمد بن سعد العجلان

# شەهیدی قارەمان «طەحمە کریم»

## ناسراوبە «ئاسۆ»



هۆبالامبۆ، هۆ شنرویّیعەشقی خۆرو هەتاو.. درەختە بالا بەرزەکانی بنارو پێی دەشت و ناو شار، دەزانم لەگەلّ ناو هێنانی هەر هەوالێك دا دلّی ئێوە رادەچلەکێ

هەرکاتێ ئیلچی هەوالێ هێنابێ زۆربەی هەوالەکان مەرگە سات بوون .. ناهەقتان نی یە، بە بیستنی هەوالەکان نیگەران بن ئای لە خۆ راگری ئێوە.. چەندین جار هەوالی دلتەزێنتان بیستووە ، هەوالی شەهید بوونی شارێک. هەلەبجەی شەهید دە ئەجارەش بۆ هەوالێکی دیکە گوێراگرن

هەوالی ئەمجارە هەوالی کۆچی (نالی) و مەرگی عەنبەر خاتوونی مەولەوی نی یە هەوالی شەهید بوونی رێبوارێکی رێگای کاروانی رووەو خۆری ئازادی ، وا ئەم جارەش شەهیدێك دێتەوەو دەیەوێ بەبەرگی خوێنینەوە .. خاك لە ئامێز بکرێ.

هۆ خاك ئەم شەهیدە بناسە. ناوی ((طـه حمه کەریمە)) .

لەسالّی ١٩٦٨ لە شاری هەلەبجەی خودا ناس و سەربەرز چاوی بۆ ژیان هەلّ هێناوە .. لە تەمەنی (٦) شەش سالیدا و لە سالّی(١٩٧٤) نێرراوەتە قوتابخانە سەرەتاو ناوەندی لە قوتابخانەی شنروێ و ناوەندی مەولەوی لە هەلەبجە تەواو کردوە

سالّی ١٩٨٤ چوتە ئامادەیی پیشەسازی هەلەبجە...



شەهید ئاسۆ هەرلەو کاتەدا ئاشنایەتی لەگەلّ بەرنامەی خوادا پەیدا کردو هەولّی فێربوونی قورئان و وانە ئاینی یەکانی داوە.

سالی(١٩٨٧ ) شەهید لە پۆلی سێ بوو کە بەعسیە فاشی یەکان شاری هەلەبجەیان بوردومان کردو زیاتر لە(٨٠) کەسی ئەوشارەیان زیندە بە چالّ کرد ـ لەبەر ئەم ستەمە خەلکی ـ کی زۆری شار ، بەرەو ئێران کۆچیان کرد کاك ئاسۆ یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لەگەلّ کۆچ کردنی رابەری کشتی بەرێز مامۆستا ( عثمان عبدالعزیزدا ) ئەویش رێگای کۆچی پیرۆزی گرتەبەرو هەرلەوکاتەوە شەهید چەکی جیهادی لە شان کرد .. کە بوو بە هۆی ئەوەی کە لە خوێندن دابرێ.

شەهید( طـه) هەرلە سەرەتاوە نازناوی ئاسوی بو خۆی هەلبژارد بۆیە دەر بە ( ئاسۆ ) ناوبانگی دەرکرد .

لەبەر لێهاتوویی و لێبراوی بۆنیەتم کراوەتە فەرماندەی تیپ و بەشداری پەلامارو پاك کردنەوەیکوردستانی لە بەعسی یەکان... کردووە..

شەهید لەخورمالّ و هەلەبجەو سیدصادق و سەرای سوبحان ئاغادا نەبەردانە رۆلّی کاریگەری هەبووە..

شەهید درێژەی بە جیهاد داوە تا لە شەوی( ٢٤ی/ ٨/ ١٩٩٤ ) لە نەبەردی یەکی کەم وێنەدا بریندار کراوە و رۆژی چوار شەممەی ( ٢٤/ ٨/ ١٩٩٤ ).... بە دیل دەگیرێ و دوایی بە شێوەیەکی نامرۆڤانە شەهید دەکرێت .

و لەگەلّ کاروانی شەهیدان دا رێگای جیهانی نەبراوە دەگرێ .

گۆرستانی هەلەبجە تەرمەکەی لە ئامێز دەگرێ .

JAMAWAR NO. 36 4th. AUG 1985

## ئیکسیری ئەوین

### جەزیری

ئیسمی تەیە مەکتوب ددیوانی قیدەمدا
حەرف ك قەلەمی عیلم بتەقویم رەقەمدا

ئەشکال و خەطین دائرەیی نوقطەیی عیلمن
ئەڤ نەقش و میثالین د خەیالاتی عەدەمدا

میم مەطلەعی شەمسا ئەحەد ئایینە صیفەت کرد
لا میع ژ عەرەب بەرق ل فەخخاری عەجەمدا

دا شاهیدی ئەسما بەهەمی وەجهی بناسن
یەك مەستی صەمەدکر بەیەکی نەقشی صەنەمدا

یەك کلاتیە زولفی ئو یەکی خال تومایی
ئایینە ب ئەسکەندەری و جام ب جەمدا

ئەرواحی موقەددەس شەبی قەدران تە دخوازن
نورا تەیە میصباح دقیندیلێ حەرەمدا

داوەقتی لیقایی بتەحەی بن دبەقایی
من نەقدی دڵ و جان دفەنایی ب سەلەمدا

یاقوت فروشان د کەف ئەلماس شکەستن
ئەڤ صەفحەیی ئەلماسی کو نەقفاشی رەقەم دا

یا رەب ز جرو لەب ب تەنایەتە کوشایم
سبحانك لن احصی في شانك حمدا

میننەت ژ خودایی کو ب عەبدی خو مەلایی
ئیکسیری غەمی عیشق نە دینار و درەم دا